١

نووسینی
وحید عبدالسلام بالی

# ٨٠ هەڵە
# لە بیرو باوەڕدا





وەرگێڕانی
ماموستا محەمەد

چاپی یەکەم
٢٠٠٧

زنجیرەی پەرتووکی (الكلمات النافعة في الأخطاء الشائعة)

بەشی یەکەم

# ٨٠ هەڵە

# لە بیروباوەڕدا

چاپی یەکەم

نووسینی
وحید بن عبدالسلام بالی

وەرگێڕانی
م. محمد

يا الله

ناوی کتێب : ٨٠ هەڵە لە بیروباوەڕدا

نـوسینی : وحیـد عبـدالسلام بـالی

وەرگێڕانی : م. محمد

ساڵی چاپ : ٢٠٠٧

چـاپـی : یـەکـەم

تـیـراژ : ( ١٠٠٠ ) دانە .

چـاپخـانـە : ا چاپخانەی ( سیما ) چاپکراوە .

تایپ و دیزاین: کۆمپیوتەری کـازیوە

ژمارەی سپاردن : ژمارە (١٠٤١) ی ساڵی (٢٠٠٧) ی وەزارەتی ڕۆشنبیری دراوەتێ.

بسم الله الرحمن الرحيم

إنّ الحمدَلله، نحمَدُهُ، ونستعينُهُ، ونستغفِرُهُ،ونعوذُ باللهِ من شرُورِ انفُسِنا، ومن سيّئاتِ اعمالنا، من يهدِاللهُ فلا مُضِلَّ له، ومن يُضْلِل فلا هادي له.
وأشهَدُ انْ لا اله الاّ الله وحدَهُ لا شريك لـه.
واشـهَدُ أنّ مُحمداً عبدُهُ ورسُولـه.
﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾.
﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا﴾.
﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا﴾.

**أمّـا بـعـدُ :**

فإنّ خيرَ الحديثِ كتابُ اللهِ، واحْسَنَ الهدي هَدْيُ محمدٍ (ﷺ)، وشَرَّ الامُورِ مُحدثاتُها، وكُلَّ مُحْدَثة بدعة، وكُلَّ بدعةٍ ضلالة، وكُلَّ ضَلالةٍ في النّار.

**پاشان:**

**هەر لەو ساتە وەختەوە کە خوای گەورە ئاييني پيرۆزی ئيسلامی کرد بەخەڵات و دياری بۆ مرۆڤايەتی، وە هەر لەو کاتەوە کە يەکەم پەڕەی**

نووریـنی قورئـانی پـیرۆز کـه نه‌خشێنرا بـوو به‌ووشـه‌ی بـه‌رزی "اقـرا" له‌ســه‌ر ڕووی ئاسمانه‌کانـه‌وه گه‌یـشته ســه‌ر ڕووی زه‌وی، هــه‌ر ئــاله‌و کاته‌وه ئه‌م دینه پیرۆزه به‌و تیشکه نوورینه خواییه جوانه‌ی خۆی بووه ڕه‌وێنه‌ره‌وه‌ی تاریکاییــه له‌سه‌ریه‌ك هه‌ڵ نیشتووه‌کانی ســه‌ر ئه‌م ڕووی زه‌وییه، وه بـووه بیروهۆشـی ئـه‌و که‌سانه‌ی کـه عه‌قڵه‌کانیان ژه‌نگی بـێ باوه‌ڕی داپۆشی بوو، وه دوور له‌خوایی سه‌ره‌کانی پـووچ کردبوونـه‌وه، هه‌تا وه‌ك مرۆڤێکی خاوه‌ن عه‌قڵ بژین به‌هۆی ئه‌م قورئانـه‌وه که شیاوی ئـه‌وه‌بن نـاوی مرۆڤیـان لێ بـنرێت، وه بـووه نـوور و تیـنی چـاوی ئـه‌و که‌سانه‌ی که چاوه‌کانیان به‌قوڵدا چووبوو له ئاستی بینینی ڕاستی ئـه‌م ڕێگه ڕاسـته‌دا چاوه‌کانیان پـه‌رده‌ی کوێری دایگرتبوو، وه بووه چراو ڕۆشنکه‌ره‌وه‌ی ئه‌و دڵانه‌ی که ڕازی بوون ببنه دڵێکی قورئانی، بۆئه‌وه‌ی لـه‌دوای وه‌رگرتنـی ئـه‌م نـووره ئیتر به‌ناڕاسـتی شـوێن کـه‌وتن و تاریـك بوونی ژیان ڕازی نه‌بنه‌وه، وه هـه‌تا به‌شوێن کـه‌وتنی ئه‌م قورئانه کـاتی ئه‌وه بێت که قوفڵ و کۆتی سه‌ر دڵه‌کان له‌سه‌ریان دابگیرێت، و وه لـه‌ژیانی دڵته‌نگییه‌وه خێرایی بکه‌ن بۆ گه‌یشتن به ژیـانی پڕ خۆشی ئیمانی لـه‌دنیادا، و وه کۆتاییه‌که‌یشی بۆنی میسك و گه‌یشتن بێت به به‌هـه‌شـتێکی نه‌بڕاوه که پانتاییه‌که‌ی ئه‌ندازه‌ی پانتـایی ئاسمانـه‌کان و زه‌وییـه، وه شـادبوون بێـت بـه مــه‌لـیـکـێکی ده‌سه‌ڵاتداری به‌خشنده‌ی لێ خۆشبوو که پێشوازیان لێ ده‌کات به‌ده‌رخـستنی ڕووه جـوانـه‌که‌ی و وه بـه زه‌رده‌خـه‌نه‌وه پێیـان ده‌فـه‌رمووێت:

**( سـلاوتان لێ بێت ئه‌ی ئه‌هـلی به‌هــه‌شـت ).**

که‌واته: ئه‌گه‌ر ئایینێکی پیرۆز بۆ ئــائه‌م مه‌به‌ستانه هاتبێت، بێگومـان مرۆڤـه دڵ نه‌خۆشـه شـه‌یتانیه سـه‌ر پووچـه‌کان هـه‌ر ئـاوا بـه ئاسـانی ده‌سته‌وسـان دانانیـشن له‌به‌رامبه‌ریـدا، بـه‌ڵکو هـه‌ر لـه‌و کاتـه‌وه گـه‌وره‌ی

پێغەمبەران(ﷺ) فەرموویەتی بڵێن: " لا الـه الاّ الله  سەرفراز دەبن"، هەر لەو کاتەوە تێگەیشتوون کە بەم بیروهۆشەی بێ باوەڕییەوە ئیتر جێیان نابێتەوە، بۆیە شەویان خستۆتە سەر ڕۆژی مایە پوچیان و،وە عەقڵیان لەگەڵ دڵە لەرزۆکەکەنیاندا خستۆتە گەڕ بۆ داڕشتنی درۆو دەلەسەو فڕو فێڵ و نەخشەی چەپەڵ لەدژی ئەم دینە سەرفرازیکەرەدا، بۆئەوەی بەڵکو بەخەیاڵی پەرتەوازەبوویان بەئەنجامدانی ئەو خراپە بێ ئەنجامانەیان دژی ئەم خۆرە بەتینەی ئیسلام بوەستنەوە، بەڵکو ئەگەر بۆ چرکەیەکیش بێت کۆسپێك لەڕێگەی ئەم نوورەدا دروست بکەن، هەتا بەهۆی ئەم چەپەڵیانەوە بنووسرێت لەڕیزی ئەو کەسانەی کە کۆمەڵێ شەیتانی ترۆ کراون، وە بەوەی هەمیشە لەهەوڵدان بەدەمە بۆگەنەکانیان درۆ و گومانی لەدژدا دروست بکەن، وە ناوو ناتۆرەی بۆ بکەن بەناو، وە لەهەوڵـدان پڕوپووچـی و بیدعـە تێکـەڵ بـەپاکی و سـپیەتی ئـەم بیروبـاوەڕی ئیـسلامەتییە بکـەن، چـونکە مرۆڤـی دوور لـەخوا وەکـو (مامۆستا نوری فارس) دەفەرموێت :

(سـەری دەیـەشێ بە بـۆی ڕیحـانە * قـالۆنچە ئـەشقی بـۆی ئـاو دەست خـانە)

بۆئەوەی ئێمەی موسوڵمانیش بەدوورکەوتنەوە لەم ئایینە پیرۆزە وەکو ئەو گەلانەمان لێبێت کە غەیری ڕێگەی خوایان هەڵبـژاردووە، لەبری پەرستنی خوای گەورە و میهرەبان، دار یان بەرد یان قەبر یان شەخص یان ئاو یان مانگا یان خۆر یان مانگ یان هەرشتێك بێت بەس غـەیری(اللـە) بێـت بپەرسـتین، وە لـەبری بیروباوەڕمـان وا بێـت بـە ئیمانـداریمان لـەدوای مردنمـان ڕوحـمان لەقوماشـی سـەوزی ئاوریـشمیدا بـەرەو علییـن و بەهەشـت دەڕوات، وامـان لێبێـت وەکـو خـەڵکی هندسـتان پەرسـتگا دروسـت دەکـەن و دەیڕازێننـەوە و مـشکی بەکۆمـەڵ تیـادا بەخێودەکـەن، بـۆ؟ چـونکە دەڵـێن: کـە مـردین ڕۆحـەکەمان دەچێتە ناو لاشەی ئەو مشکانەوە و ئەمجا بەرز دەبێتـەوە

بۆ لای خوا، یاخود هەر لە هندستان شێوازێ لەخواپەرستیان دروست کردووە، کە ئەوەیە هەموو ساڵێك لەکاتێکی دیاریکراودا هەر کەسێك ئەگەر بیەوێت ئەم پەرستنە ئەنجام بدات، دەبێت مارێك بە (٢٥) دۆلار بکرێت و بیبات بۆ ئەو پەرستگا تایبەتەی کە بۆ بەخێوکردنی ئەو مارانەیان تەرخان کردووە، وە دەبێت هەر کەسێك کە چووە ئەو پەرستگایەوە شیر لەگەڵ خۆیدا ببات و دەرخواردی ئەو مارانەی بدات، کە بەشێوەیەك ئەو خەڵکە داماوە ئەوەندە بەدڵسۆزییەوە خزمەتی ئەو مارانە دەکەن ئەوەندە شیریان بۆ دەبەن و دەرخواردیانی دەدەن، زۆربەی مارەکان بەهۆی ئەوەی کە زۆر شیریان دەدرێتێ ئینتەلا دەکەن و دەتۆپن،یاخود لای هندۆسەکان جۆرێك لە نوێژ کردنەکانیان ئەوەیە کە دەبێت هەر وەك چۆن لە سەر دووقاچت دەوەستیت، دەبێت ئاوهاش بۆ ماوەیەکی زۆر لە سەر سەر بوەستن بەپەك پەشتەمەڵەوە،کە ئەم جۆرە وەستانە یەکێکە لەو عیبادەتانەی کە خواوەندەکانیان بەم شێوە لە خۆیان ڕازی دەکەن.

یاخود لەشوێنێکی وەکو ڕوسیا ساڵانە لەکاتێکی دیاریکراودا خەڵکی ناوچەیەکی تایبەت کۆدەبنەوە، و بەگومانی خۆیان خواپەرستی ئەنجام دەدەن، کە خوا پەرستنەکەیان بریتییە لەمە:

کە هەموویان کۆبوونەوە تێر نان و هەنگوین دەخۆن و ناویان لەو ڕۆژە ناوە(ڕۆژی هەنگ)، واتە: نان و هەنگوین خواردنیان کردووە بەخواپەرستی،وبەهیواشن خوا بەخواپەرستی بۆیان حساب بکات.

پاشان خوێنەری بەڕێز وڵاتی ئێمەش وەکو هەموو ئەو وڵاتانەی تر لەخراپەی شەیتان و شوێنکەوتوانی پارێزراو نەبوون، وە ئەم پەرتووکەی کە لەبەر دەستتدایە کەمێك لەو بیدعە پڕوپووچە زۆرانەی کە هەیە لەناو خەڵکی ئێمەدا باس دەکات.

**وەپێم خۆشە چەند تێبینییەك وەك ڕوون كردنەوەیەك باس بكەم :**

* ئەم پەرتووكە لەدوو بەش پێك هاتووە: بەشی سەرەوەی بەشێكە لە پەرتووكی (**الكلمات النافعة في الاخطاء الشائعة** )ی -م. وحید عبدالسلام بالی- كە باس لەو پڕوپووچیانە دەكات كە لە وڵاتی خۆی(میسر)دا هەن و تێكەڵ بەدین كراون،وە هەندێك لەو پڕوپووچیانە سوپاس بۆ خوا لە كوردستانی ئێمەدا نی یە،بەڵام كە وەرمان گێڕاوەتە سەر زوبانی كوردی تا خەڵكی ئێمە كەمێك بەو پڕوپووچیانەی كە هەیە لەوڵاتانی تردا شارەزا ببێت. وە بەشی خوارەوەی ئەم پەرتووكە باس لە كەمێك لەو بیدعانە دەكات كە لە كوردستاندا هەیەو بڵاوەی كردووە.

* تەفسیری ئایەتەكانی ئەم پەرتووكەم لەهەردوو تەفسیری(ڕەوان و گوڵش)ەنەوە وەرگرتووە، وە بەكەمیش سوودم وەرگرتووە لەهەندێك پەرتووكی تر، خوای گەورە پاداشتی خاوەنەكانیان بداتەوە.

* هەروەها زۆر زۆر سوپاسی ئەو مامۆستایانە دەكەم كە یارمەتیان داوم،كە داواكارم لە پەروەردگار لەبری من پاداشتیان بداتەوە،وە هەروەها زۆر سوپاسی هاوڕێی خۆشەویستم (م.مصطفى) دەكەم كە بەشێكی پەراوێزەكانی خوارەوەی بۆناردووم،وە زۆر سوپاسی ئەو خوشكانە دەكەم كە بەشی زۆری پەراوێزەكان ئەوان كۆیان كردۆتەوە، كە دەپاڕێمەوە لە خوا بە خێرو چاكە بۆیان بنوسێت لە توێشوی چاكەكانیاندا.

لـــه كـۆتـايـدا: ئەگـەر هـەر هەڵەيـەكت بينـی لـەم پەرتووكـەدا ئـەوە ئاوقای شەيتان ونەفسی منی بكەن ،بەلاَم هەرچی ڕاستييەكی تيادا هەيە ناوی خوای لیّ بهيّنـە، چونكە شياوی خۆيـەتی وە بۆ ئـەويش تەنها جوانە،وە لە پەروەردگار داواكارم لە نووسەر و،وەرگيّڕو،ووەئەو كەسانەی هەستاون بە نووسين وچاپ كردنی ئەم پەرتووكـە ،و وەئـەو كەسانەی كە ئـەم پەرتووكـە دەخويّننـەوەو وە بـە خـەڵكی ڕادەگـەيـەنن خـۆش ببيّـت .

بــراتــان: م.مـحمـد

# بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

**پێشکەشە:**

بە... پێش نوێژو وتارخوێنەکان ...

بە... بـانگـخوازو زانـایـان ...

بە ... ووتار دەرە "مُحاضِر"ە بەڕێزەکان ...

بە ... چاکخوازە سەر بڵندەکان...

بەڕاستی ڕێك سازکردنو ڕاست کردنەوەی هەڵەی بەنـدەکان "العباد" نزیـك بوونەوەیـە لـە پـەروەردگاری زەویو ئاسمـان، وەمرانـدنی داهێنراوەکـان "البدع"و زیندوکردنەوەی سوننەتەکان. بریتییـە لـە کۆششو جیهادی زانـا موسـوڵمانەکان، کـە بەدەسـتەکانیان پرشـنگی ڕۆشـناییان هـەلگرتووە، هـەتا ڕێگە بۆ ئێمە ڕۆشـن بکـەنـەوە.

کـەوابوو:

ئەی زانایان بەرز هەڵبکەن ئاڵای سوننەت تا ڕێنموایمان بکەن بۆ سەر ڕێگـای ڕاسـت. خـوای گـەورە هـەنگاوەکانتان ڕاسـت ڕێ بکـات، وە بەهەشـت بکاتـە شوێنی نیـشتەجێ بونتـان.خـوای گـەورە لەگـەڵ ئێوەدایـە،و وەهـیچ شـتێ لـە پاداشتی کردەوەکانتان کـەم ناکاتەوە

**خۆشەویستتان**

**وحـیـدبـالـی**

# پێشەکی چاپی دووەم

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ڕەوانەکردووە بە ڕۆشنایی و هیدایەت و ئایینێکی ڕاست و دورستەوە، هەتا ئەم ئایینە سەر بخات بەسەر گشت ئایینەکانی تردا، با هەرچەند هاوبەش پەیداکەرەکانیش پێیان ناخۆش بێت.

وە درودو سڵاویش لەسەر پێغەمبەری خوابێت، ئەو پێغەمبەرەی کە ئێمەی جێ هێشتووە لەسەر ڕێگایەکی سپی و ڕوون و ئاشکرا، وە لەسەر ڕێگایەکی ڕاست، و ئاینێکی ڕاست.

**لە پاشاندا:**

هەر لەو کات و ساتەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: " إِيَّاكُمْ! وَمُحْدَثَاتِ الأُمُورِ فإِنَّ كلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعةٌ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ ".

واتە: ئاگاداربن و خۆتان بەدووربگرن! لە هەموو ئەو تازەداهێنراوانەی کە دەهێنرێتە ناو کاروباری ئەم دینەوە، چونکە هەموو داهێنراوێ بیدعەیە،ووە هەموو بیدعەیەکیش گومڕایی یە.

لەسەر ڕۆشنایی ئەم ئامۆژگاری یەوە هاوەڵانی پێغەمبەر "ڕەزای خوایان لێبێت" بە بەردەوامی خەڵکیان ئاگادار دەکردەوەو وورییایان دەکردنەوە لەو تازە داهێنراوانە، ئەویش کاتێ هاوەڵی بەڕێز "عبداللّە ی کوڕی مەسعود"- ڕەزای خوای لێبێت- بینی کۆمەڵە خەڵکێك لە مزگەوتدا دانیشتوون بەشێوەی بازنە بازنەی، وە لەبەردەستیاندا کۆمەڵی بەردە

وورده دانرابـوو[1]، وه لـه‌نـاو هـه‌ر یـه‌کێـك لـه‌و بازنـانـه‌دا پیاوێك پێی ده‌وتـن: ١٠٠ جـار بڵێـن: الله اکـبر، ئـه‌وانیش ١٠٠ جـار ده‌یـان ووت: **الله اکـبـر** .

پاشـان ده‌ی ووت: ١٠٠ جـار بڵێن: **لااله الا الله**، ئـه‌وانیش ١٠٠ جـار ده‌یان ووت :**لااله الا الله** .

دوای ئه‌وه ده‌ی ووت: ١٠٠جار بڵێن: **سُبحان الله**، ئه‌وانیش ١٠٠ جار ده‌یان ووت: **سُبحان الله**.

بـه‌ڵام عبداللـه‌ی کـوڕی مه‌سـعود- ڕه‌زای خـوای لێبێت- چـوو بـۆ لایـان‌و قه‌ده‌غه‌ی ئه‌م کاره‌ی لێکردن‌و فه‌رمووی: **(به‌ڵا لێتان بدات، سوێند بـه‌و ذاتـه‌ی کـه نه‌فسی منـی به‌ده‌سته، یـا ئێوه له‌سه‌ر دینێکـی هیدایـه‌ت دراوترن له‌دینی محمد (ﷺ)، یـان ئێوه بـه‌م کاره‌تـان درگـای گـومڕایی ده‌که‌نه‌وه)** [2].

پاشـان یـادکردنی خوداوسـتایش کـردن‌و پاڕانـه‌وه لێـی په‌رستشێکی "عبـادة" دروسـت‌و شـه‌رعییه، بـه‌ڵام "ابـن مسعود" ( ڕه‌زای خـوای لێبێت) ئـه‌و شـێوازو ڕێگه‌یـه‌ی لێ قه‌ده‌غـه‌کردن کـه دایـان هێنـابوو لـه ذیکرکردنه‌که‌یاندا، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌م شێوازه جێگیر نه‌بووه نه له‌لایه‌ن پێغه‌مبـه‌ره‌وه (ﷺ) وه نـه له‌لایـه‌ن خولـه‌فای ڕاشـدیینه‌وه (ڕه‌زای خوایان لێ بێت).

بـه هـه‌مان شـێوه صـه‌حابه‌و ئه‌وانـه‌ی لـه‌دوای صـه‌حابه‌وه هـاتووه "تابعین"، وه ئه‌وانه‌ی که له دوای ئه‌مانه‌وه هاتوون له پێشه‌وا به‌رچاو

---

[1] ئه‌و به‌ردانه‌یان به‌کار ده‌هێنا بۆ ژماردنی ذیکره‌کانیان، واته له‌گه‌ڵ وتنی هه‌ر ذیکرێك به به‌ردێك دیاریان ده‌کرد

[2] حدیثٌ حسنٌ: رواه الدّارمی به ژماره "٢٠٤" به سه‌نه‌دێکی "حسن "

ڕۆشن و ڕێنموایی کراو هیدایەت دراوەکان بە بەردەوامی قەدەغەیان دەکرد لە هەرکەسێ شتێکی تازە بهێنێتە ناو دینی خوداوە. لەبەر پاراستنی لایەنی شەریعەت لە دەست کاری کردن و گۆڕان کاری و ئاڵوگۆڕکردن .

**بەناوبانگترینی نوسراوەکان لەبواری بیدعەو تازە داهێنراوەکان لە دیندا:**

کاتێ کە بیدعەکان زۆربوون هەندێ لە زانایان بەتایبەت نووسراویان لەو بوارەدا نووسیوە، وە هەندێ لەو نووسراوانە وەکو:-

**١- البدعُ والنهي عنها: بیدعەکان و قەدەغە کردن لێیان**

خاوەنەکەی: (الأمام الحافظ: محمد بن وضاع القرطبي) - خوا لێی خۆش بێت- کەمردووە لە ساڵی "٢٨٦"هـ .

کە لەم پەرتووکەیدا هێناویەتی بەسەنەدەوە[١] کۆمەڵێك لە فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و کردەوەی صەحابیەکان "الآثار" لە زەم کردن و بوغزاندنی بیدعەکان و واجب بوونی دەست گرتن بە سوننەتەوە.

**وە لەئاشکراترینی بابەکانی:**

١- بابی ئەوشتانەی کە دەبن بەبیدعـــــە.

٢- بابی دروست کردن و داهێنانی بیدعە.

٣- بابی گۆڕینی بیدعەکان.

٤- بابی ئەو ووتانەی کە هاتووە لەبارەی شەوی "نیوە مانگی" مانگی شەعبان.

٥- خراپی کۆبونەوەی حاجیان لەسەر لەئێوارەی شەوی عەرەفەدا.

---

[١] سەنەد: واتە ڕشتە: بریتییە لەوەی کە هەموو ئەو کەسانەی کە ئەو فەرموودەیان گێڕاوەتەوە ناوەکەیان بهێنرێت و بووترێت.

٦- قەدەغەکردن لەدانیشتن لەگەڵ خەڵکی بیدعەچی دا.
٧- بابی: ئایا خاوەنی بیدعە تۆبەی بۆ هەیە ؟.
٨- چیرۆکی "صُبَیغ العراقي"!!.
٩- بابێ: لە هەڵوەشاندنەوەی ئاڵقە ئاڵقە پێك هێنەرەکانی دینی ئیسلامو وە دەرکەوتنی بیدعەکان.

**٢- الحوادث والبدع: تازە داهێنراوەکانو بیدعەکان.**

خاوەنەکەی : الامام ابي بكر محمد بن الوليد الطرطوشي- خوا لێی خۆش بێت- کە مردووە لەساڵی "٥٢٠"هـ .

لەم پەرتووکەیدا لە پێنج شوێندا لە "ابن وضاح"ەوە شتی وەرگرتووە، بەڵام پەرتووەکەکەی ئەم تێر وتەسەل ترەو بابەتی زۆرتر لەخۆی گرتووە وەك لە پەرتوکەکەی "ابن وضاح".

وە ئیمامی طرطوشی زۆرتر شتی وەرگرتووە لە "ئیمامی مالیك"ەوە کە بەشێوەیەك لە زیاتر لە "٩٠" شوێندا شتی لە ئیمام مالیکەوە وەرگرتووە.

وە ئیمامی طرطوشی ڕوونیشی کردۆتەوە کە ئامانجی لە نووسینی ئەم پەرتووکەدا ئەوەیە کە فەرموویەتی: " لەم پەرتووکەدا ویستمان کە تیایدا باس بکەین چەند کۆمەڵێك لەو تازە داهێنراو بیدعانەی کە دەهێنرێتە ناو کاروباری ئەم دینەوە، کە ئەو داهێنراوانە هیچ ئەصڵو بنچینەیەکیان نە لە کتێبەکەی خودا وە نەلە سوننەتی پێغەمبەرەکەیدا (ﷺ) وە نە لەیەك دەنگی "إجماع" زاناکاندا وە نە لەغەیری ئامانەیشدا نی یە."

**وە ئەم نووسراوەی "الحوادث والبدع" کراوە بەدووبەشەوە:**

- بەشێکیان تاکە تاکەو تێکڕای خەڵك دەیان زانێت کە ئەم کارانە بیدعەیەکی تازە داهێنراون،و وە یان حەرامە کردنیان یان ناپەسەندە "مکروه".

- وە بەشێکی تریشیان زۆرینەی خەڵك- جگە لە کەسێك نەبێت کە خودا پاراستویەتی- وا گومان دەبەن کە ئەو کارانە یەکێك بن لە خواپەرستیەکان "عبادات" یاخود نزیك بوونەوە لەخودا یاخود گوێڕایەڵی کردن بن بۆ خوا یاخود سوننەت بن.

**بەڵام بەشی یەکەم:** لێرەدا[1] نەچووینە سەر باس کردنی هیچ کامێك لەو بیدعانە، لەبەرئەوەی پوختەی ئەو قسە بەس بووە بۆ ئێمە کە ببێتە بەڵگە لە نەهێنانی ئەو بیدعانەدا، کە ئەویش ئەوەیە کە بەئیعترافی خودی ئەو کەسانەی کە ئەو بیدعانە ئەنجام دەدەن دەڵێن: ئەو کارانە لەدیندا نی یە.

**وە بەڵام بەشی دووەم:** لە خۆی گرتووە ئەو بیدعانەی کە مەبەستمان بووە لەم پەرتووکەدا کۆی بکەینەوە، وە مەبەستمان بووە لەهەوڵدانمان بۆ وەستاندنی موسوڵمانان لەبەردەوام بوونو ڕۆیشتن لەسەر گەندەڵیو خراپی، وە هەتا ئەم بیدعانە بە ئاکامی خراپ چوونیان نەبات لەپاشەڕۆژیاندا.

---

[1] واتە: لە کتێبی "الحوادث والبدع"دا، نەك مەبەست بە ئێرە ئەم پەرتووکە بێت کە ئێستا لە بەردەستتدایە.

وەپەرتووکەکەی بۆ (٤) باب دابەش کردووە:

**بابی یەکەم:** لەبارەی ئەو کاروبارانەوەیەکە قورئانی پیرۆز پێچاونیەتیەوەو نەی هێشتوون، کە لەڕووە ئاشکراکانیاندا "الظاهر" بە ئاسپایی مل دەنێن و دەڕۆن بەرەو تیاچوون.

**بابی دووەم:** ئەو ووتانەیە کە لە سوننەتدا هاتوون دەربارەی ئاگاداربوونەوە لە بیدعە ،ووە ئەو شتانەی کە بەگوێرەی ئارەزووی مرۆڤ دروست کرابێت.

**بابی سێهەم:** هاتووە، دەربارەی ڕێگای ڕوون و ڕێبازو بەرنامەی صەحابە - ڕەزای خوایان لێبێت- لە قەدەغەکردنی بیدعەو وازهێنان لەو شتانەی کە مرۆڤ دەگەیەنێت بە بیدعە.

**بابی چوارم:-** لە بارەی ئەو شتە سەر سوڕهێنەرانەوەیە کە لەبیدعەکاندا هاتووە، وە بەر پەرچ دانەوەو بەرهەڵستی کردن و قەدەغەکردنی ئەوشتانە لەلایەن زانایانەوە.

### ٣- تلبيسُ إبليس: ڕووکەش کردن و ساختەکردنی شەیتان

خاوەنەکەی : الأمام الحافظ: ابی الفرج بن الجوزی- خوالێی خۆش بێت- کە مردووە لەساڵی "٥٩٧"هـ.

کە ئەم پەرتووکە گشتگیرترە لە دووپەرتووکەکەی پێشوو، وە وورد ترە لە ڕێك خستنی بابەتەکانیدا.

وەدابەشی کردووە بۆ (١٣) باب:

**بابی یەکەم:** لە بارەی فەرمان کردن بە پەیوەست بوون بەسوننەتو کۆمەڵی موسوڵمانانەوەیە.

**بابی دووەم:** لە بوغزاندنو لۆمەکردنی بیدعەو بیدعەچیان.

**بابی سێهەم:** لە ئاگادار کردنەوە لە ئاشوبی شەیتانو فێڵەکانی.

**بابی چوارەم:** لەواتای "التبليسُ والغرُوُر" واتە: ساختەکاریو سەرکەشی بوون.

**بابی پێنجەم:** لەباسکردنی ساختەی شەیتان لە بیروباوەڕو ئایینەکاندا.

**بابی شەشەم:** لە باسکردنی ساختەکردنی شەیتان لە زاناکان لە زانستە جۆراو جۆرەکاندا.

**بابی حەوتەم:** لەباسکردنی ساختەی شەیتان لە کاربەدەستو فەرمانڕەواکان.

**بابی هەشتەم:** لەباسکردنی ساختەکردنی شەیتان لەخواپەرستان لەخواپەرستیە جۆراو جۆرەکاندا.

**بابی نۆیەم:** لە باسکردنی ساختەکردنی شەیتان لەزاهیدو دونیا نەویستەکان.

**بابی دەیەم:** لەباسکردنی ساختەکردنی شەیتان لە سۆفیەکان.

**بابی یانزەهەم:** لەباسکردنی ساختەکردنی شەیتان لە ئایین پەروەرەکان "مُتدين" بەو شتانەی کە لەکەرامات دەچێت.

**بابی دوانزەهەم:** لەباسکردنی ساختەکردنی شەیتان لەتێکڕای خەڵکی نەزان.

**بابی سیانزەهەم:** لەباسکردنی ساختەکردنی شەیتان لەسەر هەموو خەڵکی بەهیوا نەبڕانەوە لەژیانی دونیادا "طولُ الأمل".

**٤- الباعثُ على إنكار البدع والحوادث: بەخەبەرهێن لە قەدەغەکردنی بیدعەو تازەداهێنراوەکاندا.**

خاوەنەکەی : الأمام ابي شامة المقدسي -خوا لێی خۆش بێت- کە مردووە لەساڵی "٦٦٥"هـ .

**لەگرنگترینی بەشەکانی:**

١- ئاگادارکردنەوەی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی لەبیدعە.

٢- فەصڵێکە: لە قەدەغەکردنو بەرهەڵستی کردنی کاری ناشیاو،ووە زیندووکردنەوەی سوننەت.

٣- فەصڵێکە: لەواتاو بناغەی بیدعە.

٤- فەصڵێکە: لەدابەش کردنی تازە داهێنراوەکان بۆ بیدعەی بەچاك دانراوەکان،ووە بیدعەی بەخراپو ناشیرین دانراوەکان.

٥- فەصڵێکە: لەو شتانەی کە بوونەتە بیدعەیەکی بەناوبانگ،ووە بڵاوەیان کردووە لەوڵاتی موسوڵمانانندا.

**٥- إقتضاءُ الصِّراطِ المستقيم مخالفة أصحاب الجحيم: گرتنەبەری ڕێگای ڕاست بەسەر پێچی کردنی خەڵکانی دۆزەخی.**

خاوەنەکەی: پێشەوای شەکاوە شێخ الاسلام " ابن تيميه "يە -خوا لێی خۆش بێت-، کە مردووە لەساڵی "٧٢٨" هـ .

کە لەم پەرتووکەیدا باسی کۆمەڵێکی زۆری کردووە لەو بیدعانەی کە هاتوونەتە ناو وڵاتی موسڵمانانەوە،و وە ئەم بیدعانە هۆکارێك بوون

لەشوبهاندنو خۆچواندنی هەندێ لەموسولمانان بەگاورو جوولەکەوە یاخود بەکافرانەوە.

**لەگرنگترین بابەتەکانی:**

- **فصلێکە:** لەواجب بوونی شوێن کەوتنی قورئانو سوننەت،ووە دوورکەوتنەوەو لەخۆچواندن بەکافرانەوە.

- **فصلێکە:** لەسەر پێچی کردنی غەیری موسولمانان لە عیبادەتو نەریتەکانیاندا.

- **فصلێکە:** لەفەرمان کردن بە پێچەوانەو موخالەفەکردنی جەژنی هاوبەشی پەیداکەرەکان.

- **فصلێکە:** دەربارەی ئەو بیدعانەی کە موسولمانان دایان هێناوەو دروستیان کردووە لە جەژنەکاندا.

- بیدعەی قەبر پەرستەکانو بەرپەرچ دانەوەو ڕەت دانەوەیان.

وە لەم پەرتووکەدا کۆمەڵی بابەتی دارشتووە،وهۆنیویەتیەوە کە پێویست بوون بۆ ئەو بابەتانە داخوازی دەکا کە دەبێت ئەم بابەتانەش هەبن، وەکو:

- حوکمی قسەکردن بە غەیری زمانی عەرەبی[1]

- حوکمی پێشکەش کردنی دیاری بەکافرەکان لەجەژنەکانیاندا.

---

[1] واتە: بۆ کەسانێ کە خۆیان عەرەبن،و بەلام ووشەی زمانی بێگانە لەجیاتی زمانی خۆیان بەجوانتر دەزانن و بەکاری دەهێنن، نەك بۆ گشت میللەتەکان وابێت کە دەبێت بە عەرەبی قسە بکەن، کە ئەمە لەئیسلامدا نییە.

- حوكمی پاڕانەوە لەخودا لە لای گۆڕی پێغەمبەر (ﷺ) ........ و وە جگە لەمانەش.

٦- الفرقانُ بينَ اولياءِ الرحمن و أولياء الشيطان: جیاکەرەوە لەنێوان دۆستانی خوداو ودۆستانی شەیتان.

خاوەنەکەی : هەر شیخ الاسلام "ابن تيمية" یە.

کە لەم پەرتووکەیدا دواوە لەبارەی بیدعەو قسەی پڕو پووچی دۆستانی شەیتان لە قەبر پەرستو بیدعەچییەکان.

وە تیایدا جیاوازی کردووە لەنێوان کەراماتی ڕاستی بۆ دۆستانی خودا،ووە لەنێوان "خوارقُ العادة"دا واتە: ئەو شتانەی کە بەدەرن لە نەریتو توانای مرۆڤـ کە شەیتانەکان دروستی دەکەن بۆ دۆستانو شوێن کەوتووەکانیان لە بیدعەچیو قەبر پەرستەکان.

٧- المدخل: ڕێـڕەو

خاوەنەکەی : أبي عبدالله بن محمد بن محمد العبدري الفارسی الشهير بـ "أبن الحاج"- خودا لێی خۆش بێت- کە مرووە لە ساڵی "٧٣٢"هـ .

کە لەم پەرتووکەیدا ناوی هێناوەوباسی کردووە کۆمەڵێکی زۆر زۆر لەو بیدعانەی کە بەربڵاوو زۆر بوونو هەبوون لەسەردەمی خۆیدا، وە کتێبەکەی بەگوێرەی ئەبوابە فیقهیەکان ڕێك خستووە. وەناوی ناوە ( ڕێڕەوێك "المدخل" بۆ گەشە سەندنی کردووەکان بەچاك کردنی نیەتەکانیان، وە ئاگاداری کردنەوە لە هەندێ بیدعە،ووە ئەو نەریتانەی کە بەربڵاوو تەشەنەیان کردووە، وە ڕوون کردنەوەی ناشیرینی ئەو کارانە).

وه باسی ئەو شتانەی کردووه که پێویسته بەنده "العبد" ئاگاداریان بێ له کردەوەکانیدا، پاشان لەبەرامبەریدا هەندێ بیدعەی هێناوه که پەیوەسته بەو کردەوەوه، و وه دروست کراوه لەدژی ئەو کردەوەدا.

**هەندێ لەوانه :**

- ئەو بیدعانەی که پەیوەستن بەدەست نوێژو نوێژو مزگەوتەوه.
- بیدعەی ئافرەتان لەجل‌وبەرگ‌و چوونەدەرەوەو کۆبوونەوەیان لەگەڵ یەکتری داو وه جگه لەمانه.
- بیدعەی لەدایك بوون.
- بۆنەو ئاهەنگەکانی ئەهلی کیتاب.
- بیدعەی بانگ.
- بیدعەی نوێژی هەینی‌و نوێژەکانی تر.
- هەڵسوکەوتی موجاهیدو بیدعەی جیهادکردن.
- بیدعەی سۆفییەکان.
- بیدعەی ئیش‌وکار، وەکو جووتیاری،و جل دوورین،و ووردەواڵە فرۆشتن،و بازرگانی، وه بیدعەی زەڕەنگەری،و پارەگۆڕینەوه، وچێشت لێنەر، ووێنەی ئەمانه.

وه ئەم پەرتووکه لەخۆی گرتووه زۆرینەیەك لەو بیدعانەی کەوا هەبوون لەسەردەمی نووسەردا، پاشان ئەم پەرتووکه فەوتاوەو وەئێستا هیچ شوێنەوارو بونێکی نییه.

**ئەو سەر زەنشتانەی که لەسەر ئەم پەرتووکه هەیه:**

هەرچەنده ئەم پەرتووکی "المدخل" ئاگاداری بوونی لەخۆی گرتووه لەسەر ژمارەیەکی زۆر له بیدعه، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا "ابن الحاج" خودی خۆیشی کەوتۆته چەندەها هەڵەی گەورەوه، لەوانه:

١- وتن‌و دان پیانان بەدروستیەتی تبرك کردن به قەبرەوه.
٢- وتن‌و دان پیانان بەدروستیەتی تکاکردن له مردووان.
٣- وتن‌و دان پیانان بەدروستیەتی ڕۆیشتن بۆ لای قەبر تاپاڕانەوەی لەلادا بکەی.

٤- دروستیەتی کردنی خاوەن قەبر بە نوێنەر "الوسیط" بۆ لای خودا لە پاڕانەوەو شتی تردا.
بەڵام بەدواداچوونی ئەم هەڵانەی کردووە: د. محمد بن عبدالله الخميس لە ڕیسالەیەکدا بەناونیشانی "المنخل لغربلة خرافات ابن الحاج في المدخل"[1]، واتە: بیژنگێك بۆ بێژانەوەو پاکژکردنی پڕوپووچی یەکانی "ابن الحاج" لە پەرتووکی "المدخل"دا.
کە بەشێوەیەك بەدواداچوونی ئەم هەڵانەی کردووە لە بیست و شەش شوێندا، کە سوودمەندیەکی زۆری بەخشیوە،وە هەوڵ و کۆشش و تەقەلایەکی زۆریشی تیادا کردووە.

## ٨- الأعتصام: پەناگرتنەبەر

خاوەنەکەی : الامام الاصولي أبي اسحاق إبراهيم بن موسى الشاطبي - خوا لێی خۆش بێت- کە مردووە لەساڵی "٧٩٠"هـ .
وە ئیمامی شاطبي دادەنرێت بە یەکەم کەسێك کە زانستی ناسینەوەی بیدعەی ڕێك خستووەو بنچینەکانی داناوە،وە بناغەکانی زانستی بیدعەی جێگیر کردووە.وە شاطبي جیادەکرێتەوە بە قوڵی بەڵگە هێنانەوەو هێنانی قسەی نموونەیی و نەستەق.
**وە پەرتووکەکەی دابەش کردووە بۆ (١٠) باب:**
**بابی یەکەم:** پێناسەی بیدعە.
**بابی دووەم:** بوغزاندنی بیدعەو خراپی پاشەڕۆژی بیدعەچی.
**بابی سێهەم:** بوغزاندن و خراپ ناساندنی بیدعە بەشێوەیەکی گشتی کە بیدعە هەمووی مەزمومە، بەبێ جیاکردنەوەی بیدعەیەك لە بیدعەیەکی تر.

---

[1] ئەم بابەتە لەگەڵ کۆمەڵێك بابەتی تردایە، لەژێر ناونیشانی " التنبيهاتُ السنية على الهفوات العقدية ".

**بابی چوارەم:** سەرزەنشت کردن و سەرکوتانەوەی خەڵکانی بیدعە چی بە بەڵگە هێنانەوە لەسەریان.
**بابی پێنجەم:** یاساکانی بیدعەی حەقیقی و بیدعەی زیادە[1].
**بابی شەشەم:** یاساکانی بیدعە وە ئەمەش هەموویان لەسەر یەك پلە نین.
**بابی حەوتەم:** ئایا داهێنان و دروست کردنی بیدعە دەچێتە ژێر کاروباری ئاساییەوە؟
**بابی هەشتەم:** جیاوازی لەنێوان بیدعەکان و بەرژەوەندییە تایبەتیەکان و وە بەجوان دانانی هەندێ ڕووداو.
**بابی نۆیەم:** ئەو هۆکارەی کە لەپێناویاندا جیابۆتەوە کۆمەڵی بیدعە چییەکان لە کۆمەڵی موسوڵمانان.
**بابی دەیەم:** مانای ئەو ڕێگا ڕاستەی کە لێی لاداوە ڕێگاکانی خەڵکی بیدعەچی.
پاشان ئەم پەرتووکە پەرتووکێکی بەنرخە، وە توێژینەوەی بەچێژ و بابەتانێکی فراوانی تێدایە.

**٩- اللُّمع في الحوادث والبدع: درەوشاوەکان لە تازە داهێنراو بیدعەکاندا**

خاوەنەکەی : صفي الدين ابن التركماني، کەنزیکەی ساڵی "٨٥٠"هـ مردووە.

**١٠- البدع والحوادث: بیدعەکان و تازە داهێنراوەکان**

خاوەنەکەی : احمد بن احمد البرنسي الفاسي، کە مردووە لەساڵی "٨٩٩"هـ.

---

[1] **بیدعەی حەقیقی:** بریتییە لەو بیدعەیەی کە ئەصڵ و بنچینەیەکی لەدیندا نییە، بەڵام بیدعەی زیادە: بریتییە لە کردەوەیەك کە ئەصڵی لەدیندا هەیە،وە کارێکی بیدعە نییە، بەڵام ئەو کردەوە لەشوێنەکەی خۆیدا ناکرێ و بە ئەنجام ناگەیەنرێت، بەڵکو لە شوێنێکی تردا دەکرێت کە شوێنی خۆی نییە،وە بەپێی کردنی لەو شوێنەی غەیری خۆیدا دەبێ بە بیدعە.

**١١- الأمرُ بالاتباع والنهيُ عن الأبتداع:** فەرمان كردن بەشوێن كەوتنی سوننەتو وەقەدەغەكردن لە بیدعە دروست كردن.

خاوەنەكەی : الأمام السیوطي، كە مردووە لەساڵی "٩١١" هـ .

**١٢- إحياءُ السنةِ واجمادُ البدعة:** زیندووكردنەوەی سوننەتو لەجوڵە خستنو ڕاگرتنی بیدعـە .

خاوەنەكەی : عثمان بن فودی، كەمردووە لەساڵی "١٢٣٢" هـ .

**١٣- الأبداعُ في مضّار الابتداع:** داهێنان لەزیانەكانی بیدعە داهێنراوەكان.

خاوەنەكەی : الشیخ علـي محفـوظ- خـوا لێـی خـۆش بێـت- كـە مـردووە لەساڵی "١٣٦٠" هـ دا، یاخود لەدوای ئەم ساڵەوە.

**١٤- السنن والمبتدعات:** سوننەكانو داهێنراوەكان.

خاوەنەكەی : محمد بن احمد بن عبدالسلام الشقیری -خودا لێی خۆش بێت.

**١٥- إصلاحُ المساجد من البدع والعوائد:** چاكسازی كردنی مزگەوتەكان لە بیدعەكان ووە ئەو نەریتانەی كە بەربڵاون.

خاوەنەكەی : محمد جمال الدین القاسمي - خوا لێی خۆش بێت-.

**١٦- الـردُّ علـى اهـل الأهـواء والبـدع:** بەرپەرچ دانەوەی خەڵكانێ كـە شوێن ئارەزوویان كەوتوونو وەبیدعە چین.

خاوەنەكەی: محمد بن احمد الملطي الشافعي.

**١٧- البدعة اسبابها ومضارها:** بیدعەو هـۆكـارەكـانـیو زیـانـەكـانی.

خاوەنەكەی: محمود شلتون- خودا لێی خۆش بێت-.

**١٨- رَدْعُ الانـام عـن محـدثـات عاشـر المحـرم الحـرام:** گێڕانـەوەو ترساندنی خەڵكی لە داهێنراوەكانی "دەهەمین ڕۆژی مانگی موحەرەم".

خاوەنەكەی : أبو الطیب محمد عطاء الله ضیف.

١٩- اصولٌ في السنن والبدع: بنچینەو بناغەکان لە سوننەتەکان و بیدعەکاندا.
خاوەنەکەی : محمد احمد العدوی- خودا لێی خۆش بێت-.
٢٠- بدع الجنائز (في نهاية احكام الجنائز): بیدعەکانی جەنازە.
٢١- بدع الحج (في نهاية مناسك الحج والعمرة): بیدعەکانی حەج.
خاوەنی ئەم دوو پەرتووکە: زانای فەرموودەناس "ناصر الدین الالبانی"یە - خودا لێی خۆش بێت-.
٢٢- كمالُ الشرعِ وخطرُ الابتداع: تەواویەتی شەرعو ترسناکی بیدعەو داهێنراوەکان.
خاوەنەکەی: العلامة "محمد الصالح بن عثیمین" - خودا لێی خۆش بێت-.
٢٣- تحذيرُ المسلمينَ من الابتداع في الدِّين: ئاگادارکردنەوەی موسوڵمانان لە بیدعەو داهێنراوەکان لەدیندا.
خاوەنەکەی : ابن حجر آل بو طامي.
٢٤- البدعة: بیدعە. عزت عطية.
٢٥- مُعجم المَناهي اللفظية: قاموسی قەدەغە لێکراوە ووتراوەکان.
٢٦- تصحيحُ الدعاء: ڕاست کردنەوەی نزاو پاڕانەوەکان.
کەنووسەر لەم پەرتووکەدا بە تەنها بەشێکی جیاکردۆتەوە تیایدا بەناونیشانی "بدعُ القرّاء" واتە: بیدعەی قورئان خوێنەکان.
٢٧- الردود: ڕەت دانەوەکان.
٢٨- جزءٌ في مسح الوجه باليدين بعد رفعهما للدعاء: بەشێك: لە مەسح کردنی دەمو چاو بەدوو دەستەکان لەدوای بەرزکردنەوەی هەردوو دەستەکان بۆ پاڕانەوە.
ئەم "٤" پەرتووکە خاوەنەکەی : فضيلة الدكتور" بكر بن عبدالله ابي زيد" - خوا بیپارێزێت-.
٢٩- بدعُ القُرّاءِ: بیدعەی قورئان خوێنەکان.
خاوەنەکەی : محمد موسی نصر.

٣٠- **القولُ المُبين في اخطاء المصلين**: قسەی ڕۆشنکەرەوە لەهەڵەی نوێژ خوێنەکاندا.

٣١- **كُتُبٌ حَذَّرَ منها العلماء**: چەند پەرتووکێك کە زانایان خەڵکیان لێ ئاگاداركردۆتەوە.

هەردووکیان خاوەنەکەی: مشهور بن حسن سلمان.

٣٢- **المسجدُ في الاسلام**: مزگەوت لە ئیسلامدا.

خاوەنەکەی : خير الدين وانلي.

٣٣- **مخالفاتٌ في الطهارة والصلاة والمساجد**: سەرپێچیەکان لەپاکوخاوێنی و نوێژ و مزگەوتەکاندا.

خاوەنەکەی: عبدالعزيز السرحان.

٣٤- **أحكامُ التشميتِ وبِدَعِها**: یاساکانی پژمین و بیدعەکانی .

٣٥- **الاعلامُ بذكرِ المصنفاتِ التي حَذَّرَ منها شيخُ الاسلام**: ڕاگەیاندن بەباس کردنی ئەو پەرتووکانەی کەوا شێخ الاسلام وریایی داوە لەبارەیانەوە.

٣٦- **تصحيحُ الاوهامِ الواقعةِ في فهمِ احاديثِ الرسولِ "عليه السّلام"**: ڕاست کردنەوەی ئەو بەهەڵەداچوونانەی کە ڕووی داوە لە تێگەیشتنی فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)دا.

٣٧- **مُنكراتُ البيوت**: شتە نەویستراو ناپەسەندو خراپەکانی ماڵەکان.

٣٨- **مُنكرات الاسواق**: شتە نەویستراو ناپەسەندو خراپەکانی بازاڕەکان.

٣٩- **مُعجمُ البِدعِ**: فەرهەنگی بیدعەکان. ئەمانەش خاوەنەکەیان: رائد بن ابي علفە.

٤٠- **حقيقةُ البدعة**: ڕاستی بیدعە، واتە: ئاشکراکردنی خراپیەکانی بیدعە.

خاوەنەکەی: سعيد الغامدي

٤١- **المنظار في بيان كثير من الاخطاء الشائعة :** دووربين لەڕوون کردنەوەی زۆرینەیەك لەو هەڵانەی کە بەربڵاون.

خاوەنەکەی : صالح بن عبدالعزيز ال الشيخ.

٤٢- **تحذيرُ الراكعين الساجدين ببعض أخطاء المصلين:** ئاگادارکردنەوەی کڕنوش بەرەو سوجدەبەرەکان بەهەندێ لە هەڵەی نوێژ خوێنەکان.

خاوەنەکەی : عبده الاقرع.

٤٣- **أخطاءُ المصلين:** هەڵەی نوێژ خوێنەکان.

خاوەنەکەی: محمد صديق المنشاوی السوهاجی.

٤٤- **أخطاءُ المصلين:** هەڵەی نوێژ خوێنەکان.

خاوەنەکەی : محمود المصری.

٤٥- **جامعُ أخطاءِ المصلين:** کۆکەرەوە لە هەڵەی نوێژخوێنەکاندا.

خاوەنەکەی : مسعد کامل.

٤٦- **المنهياتُ الشرعية في صفة الصلاة:** قەدەغە لێکراوە شەرعیەکان لە چۆنیەتی کردنی نوێژدا. عبدالرؤوف الکمالي.

٤٧- **مبتدعات وعادات :** داهێنراوەکان و نەریتەکان.

خاوەنەکەی: د. محمد عبدالقادر ابو فارس.

٤٨- **السننُ والمبتدعات:** سوننەتەکان و داهێنراوەکان. عمروسليم.

٤٩- **الأقوالُ النافعةُ لإزالةِ بعضِ المنكراتِ الواقعةِ :** چەند قسانێکی بەسوود بۆ لابردنی هەندێ لەو کارە ناپەسەندانەی کە ڕوویان داوە.

على بن عبدالعزيز موسى .

٥٠- **سلسلةُ أخطاء في السلوك والتعامل:** زنجیرەیەك هەڵە لە ڕەفتارەو هەڵسوکەوتەکاندا. محمد بن ابراهيم الحمد.

٥١- **التنبيهاتُ السنية على الهفوات العَقَدية في بعض الكتب العلمية**:

د. محمد بن عبدالرحمن الخميس.

٥٢- **البدعُ والمُحْدثات ومالا اصلَ لـه**: بيدعەو تازە داهێنراوەکانو وەئەو شتانەی کە هیچ بنچینەیەکیان نییە. حمود بن عبدالله المطر.

٥٣- **علمُ أصولِ البدعِ**: زانستی بنچینەکانی بیدعە. علي بن حسن الحلبي.

٥٤- **بـدعُ الاعتقاد**: بیدعەکانی بیروباوەڕ. محمد حامد الناصر.

# چۆن بیدعـه دەنـاسیتـەوە ؟

**شێخ ئەلبانی**- خودا لێی خۆش بێت- فەرموویەتی: ئەو بیدعەیەکی کە بەڕاشکاوی دەق هاتووە لەسەر گومڕایەتی یەکەی لەلایەن خوای گەورە کە شارع‌و شرع دانەرە، بریتییە لـــــە:

١- هەرشتێ دژواریـەتی سوننەت بکـات، ئیتر قسە بێت یاخود کـردار بێت، یاخود بیروباوەڕی بێت با هەرچەندە لە ئیجتیهادیشەوە بێت.

٢- هەر کارو فرمانێ کە بەهۆیـەوە نزیك ببیتەوە لـە خـودای گەورە، وە پێغەمبەریش قەدەغەو نەهی کردبێت لەو کارو فرمانە.

٣- هەر کارو فرمانێ کە نـەدەتوانرا کـەوا دابڕێـژرێت‌و شـەرعی بکرێـت جگە بەدەقێکی قورئـان‌و سـوننەت نـەبێت، یـاخود بە ڕەوەسـتان نـەبێت لەسەری [1]، وە ئـەوکارەش هـیچ دەقێکـی لـە قورئـان‌و سـوننەتی لەسـەر نەبوو، ئەوە بیدعەیە ئیللا مەگەر کارێك نەبێ کە لەصەحابیەکەوە هاتبێ کە کردوویەتی.

٤- ئـەو شـتانەی کـە لکێنـراون بەخواپەرسـتیەوە "عبـادة" لـە نـەریتی "عادات" کافرەکان.

٥- ئەو کارانـەی کـە هەنـدێ لـەزانایان دەقیـان هێنـاوە لەسـەر سوننەت بوونی ئەو کارانە بەتایبەت هەندێ لەزانا دواییـنەکان "المتـأخرین"، وە هیچ بەڵگەیەك لەسەر ئەو کارانە نەبێت.

٦- هەموو خواپەرستیەك "عبادة"چۆنیەتی کردنەکەی نەهاتبێ جگە لە فەرموودەی لاوازو هەڵبەستراودا نەبێ.

٧- ڕۆچوون‌و سنوور شکاندن"الغلو" لەخواپەرستیدا.

---

[1] واتە: نازانی چی بڵێی لەبارەیەوە

٨- هەر خواپەرستیەك كە خوای گەورە دای نابێت، وە هەندیَ لەخەڵك ئەو خواپەرستیەیان پابەندو پەیوەستیان كردبوو بە هەندیَ كۆتەوە، وەكو: شوێن یان كات یان شێواز یان ژمارە، ئەوا ئەو كۆتانە بدعەن.[1] .

لەپاشاندا ئەم بناغانە شیاوی ئەوەن كە بەئاوی ئاڵتون بنووسرێنەوە، چونكە هەڵقولاّوە لەشارەزایی و بەدوادا گەڕان،ووە گوشینی بیروهۆش، و بەرهەمی تێگەیشتن.

وە لـــــەدوایـیدا:

ئەم پەرتووكە هەموو بەشەكانی ناونراوە بە (الكلمات النافعة في الاخطاء الشائعة)، واتە: چەند ووشانێكی بەسوود لەچەند هەلاّنێكی بەربلاّودا. هەوڵم داوە كە شێوازی دەربڕینەكەی ئاسان بێت، وە قسەش لەسەر هەڵەكان بەكورتی بێت، وە پاڵ پشت كرابی بە بەڵگەوە، هەتاوەكو ڕیَ خۆش كەربێت بۆ پێشەواو وتار خوێنەكان بەخوێندنەوەیان بەسەر نوێژخوێنەكاندا، بەتكای سوود وەرگرتن و پاداشت لەلایەن خوداوە.

نووسیویەتی هەژارترین دروست كراوە بۆ لای خودا:

وحيد بن عبدالسلام بالی

منشأة عباس

لـە ١٤٢٤/٤/١٢هـ

---

[1] احكام الجنائز (٢٤٢).

## بەناوی خوای گەورەومیهرەبان

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەی کە خۆشەویستی کردووە لەلای خۆشەویستان و دۆستانی پەرستش و گوێڕایەڵی کردنی، وە ڕق لێ بوون و ناشیرینی کردووە لەلایان سەر پێچی کردنی، وە تەڕو پاراوی کردووە زمانیان بەیادکردنەوەی، وە شاهیدی دەدەم کە هیچ ذاتێك نیە بە حەق جگە لەذاتی "الله" نەبێت، تاك و تەنهایەو وە هیچ هاوبەشێکی نییە، وە شاهیدی دەدەم کە "محمد" (ﷺ) بەندەو ڕەوانەکراوی خودایە.

**وە لەدواییدا:**

بەڕاستی گەورەترین و باشترین جیهاد: جیهادی زانست و بانگ خوازی کردنە بۆلای خودا، وە لەچاکترین بابەکانی: چاو ڕۆشن کردنی خەڵکییە بەیاساکانی بیروباوەڕو شەریعەت، وە ڕاست کردنەوەی هەڵەکانیان،و وە ئاگادار کردنەوەیان لەسەر لاری و خوارییەکانیان، لەبەر ئەوەی بانگ خواز "الداعیة" پزیشکە لەناو کۆمەڵگەکەیدا، نەخۆشیەکان دیاری دەکات،و وە دەردەهێنێ لە دەقە شەرعیەکاندا دەرمانی سەرکەوتوو بەسوود بۆیان.

وە لێرەدا من پێم خۆش بوو کەوا بخەمە بەردەستی برایانم لە بانگ خوازو قوتابی زانست خواز، ئەو شتانەی کە لەسەری وەستاوم لە هەڵەی خەڵکی نەزان لە بیروباوەڕو خواپەرستیەکان و کڕین و فرۆشتندا، بەتاج لەسەرنانی ئەمانە بە بەڵگەی ڕاشکاو لە قورئان و فەرموودەی

ڕاستی پێغەمبەر (ﷺ)، هەتاوەکو هەموو ووتارخوێنێ یاخود ئامۆژگاری خوازێ یاخود هەموو چاکخوازێ وەری بگرێت لەو بەڵگانە ئەو شتانەی کەوا لەگەڵ کۆمەڵگەکەیدا دەگونجێت، تا خەڵکی لەسەر ئاگادار بکەنەوە، وە خۆزگەیا هەندێك لە گەنجان هەستانایە بە خوێندنەوەی ئەم هەڵانە بە سەر خەڵکیدا لەدوای نوێژەکان، ئەوا ئەو گەنجانە پاداشتێکی زۆرو بێ پایانیان دەست دەکەوت بەهۆی ڕاست کردنەوەی بیرو باوەڕو چاککردن خواپەرستیەکان لەلایی زۆرینەیەك لە خەڵکی، یاخود هەندێ لە ووتارخوێنەکانی کورتیان بکردایەتەوەو بیان وتایەو دەریان ببڕیایە لە زنجیرەیەکی بەسوود لە وو تارەکانی ڕۆژی هەینیاندا.

پاشان ئەگەر خوای گەورە ئەم کارە ئاسان بکاتو درێژە بدات بە تەمەن، ئەوا بەدواداچوونی ئەو هەڵانە دەکەین لە تێکڕای گشت ئەم زنجیرە باسەدا ئەگەر خودا ویستی لەسەر ببێت "انشاء الله".

وە ئەم زنجیرەیەش پێك هاتووە لەم بەشانە:

١-کۆمەڵێك هەڵە لەبیروباوەڕدا.

٢-کۆمەڵێك هەڵە لە پاكو خاوێنیدا.

٣- کۆمەڵێك هەڵە لە بانگو قامەت کردندا.

٤- کۆمەڵێك هەڵە لە نوێژدا.

٥- کۆمەڵێك هەڵە لە نوێژی هەینی دا.

٦- کۆمەڵێك هەڵە لە نوێژی بەکۆمەڵ کردن "الجماعة"دا.

٧- کۆمەڵێك هەڵە لە دوو نوێژی هەردوو جەژنەکاندا.

٨- کۆمەڵێك هەڵە لە مزگەوتەکاندا .

٩- کۆمەڵێك هەڵە لە ڕۆژو گرتندا.

١٠- کۆمەڵێك هەڵە لە لەزەکات دەرکردن لەماڵو ساماندا.

١١- کۆمەڵێك هەڵە لەحەج کردندا.

١٢- کۆمەڵێك هەڵە لە جەنازەدا.

١٣- کۆمەڵێك هەڵە لە ئاڵو وێڵ کردندا "معاملات".

١٤- کۆمەڵێك هەڵە لە پەروەردەکردنی منداڵاندا.

١٥- کۆمەڵێك هەڵە لە بۆنەو ئاهەنگەکاندا.

١٦- کۆمەڵێك هەڵە لە ژیانی خێزانی دا.

١٧- کۆمەڵێك هەڵە لە دانیشتنو وتوێژکردن لەگەڵ یەکتریدا.

١٨- کۆمەڵێك هەڵە لە کڕینو فرۆشتندا.

١٩- کۆمەڵێك هەڵە لە وەسیەت کردندا بۆ دوای مردن.

٢٠- کۆمەڵێك هەڵە لە شەریکایەتی کردندا.

٢١- کۆمەڵێك هەڵە لەژن هێناندا.

٢٢- کۆمەڵێك هەڵە لەژن تەڵاق داندا.

٢٣- کۆمەڵێك هەڵە لە تاوانەکانو خوێن باییەکاندا.

٢٤- کۆمەڵێك هەڵە لەخواردەمەنیو سەر بڕاوەکاندا.

٢٥- کۆمەڵێك هەڵە لە دادگاو شایەتیداندا.

وە داواکارین لەخوای گەورە کە ببەخشێت پێمان ڕاست گۆی، و دڵسۆزی، وەکۆمەکی کردن، و سەرکەوتووی، وەهیدایەت، و جێگیربوون لەسەر هەق، وە ووتنی ڕاستی لە قسەو کردەوەدا، وە سوودمەندمان بکات پێیان لەژیانی دونیاو وە لەپاش مردنیش، چونکە تەنها خۆی لێ خۆش بووە بۆ هەڵەکانە، وە بۆ لادانو بێ هەڵ خزانەکان لە ڕێگای ڕاستو حەق، وە تەنها خۆیشی وەڵام دەرەوەی نزاکانە.

**وصلِّ اللهم على محمدٍ وعلى آله وصحبه اجمعين**

## ١- هانا بردن بۆ مردووان: الاستغاثة بالأموات

لەناو خەڵكيدا كەسانێكی وا هەيە هاوارو هاناو پەنا دەبات بۆ مردووان، بۆ نموونە: ئەگەر هاتوو كەوتە ناو خەم و خەفەتو ناڕەحەتی يەكەوە، دەڵێت: "ئەی بەدەوی[1] بێ بەهانامەوە"، ياخود "ئەی دسوقی[2] بگە بە فريام".

كەچی هانابردنو داوای بەفرياكەوتن عيبادەتو پەرستشە، كە پێويستە ڕواڕو نەكرێتو بەكارنەهێنرێت جگە لە بۆ تەنها خودای پەروەردگار نەبێت، وە هەر لە بەر ئەوەش بوو كاتێك هاوەڵان "صحابە" - ڕەزای خوايان لێبێت- لە جەنگی بەدردا زۆری ژمارەی هاوبەش پەيداكەرەكانو كەمی ژمارەی خۆيانيان بينی، لەگەڵ سەخت بوونی جەنگو زۆربوونی ناڕەحەتی لەسەريان، وە لەگەڵ بوونی هەموو ئەمانەشدا هۆمەنو پەنايان نەبردە بەر پێغەمبەر (ﷺ)، كە پێغەمبەر (ﷺ) گەورەی هەموو پياوچاكانو پێشەوای هەموو پێغەمبەرانيشە

---

[1] بەدەوی: ناوی "شەهاب الدّين ئەحمەد"ە ، لەشاری "فاس"ی ولاتی مەغريب لەدايك بووە، وە لەساڵی ١٢٧٦ز دا مردووە لەشاری طە نطای ميسر، واتە هەزار ساڵێكە مردووە، يەكێكە لە گەورەی سۆفييەكان، وە قەبرەكەی كراوە بە مەزارگاو شەخصێكی بەناوبانگ ،كەساڵانە لەكاتێكی تايبەتدا خەڵكی لەناوخۆ و دەرەوەی ميسرەوە دەچن بۆ سەر قەبرەكەی، كە ئەوەندە خەڵك دەچێت وەكو ڕۆژی حەجولئەكبەر وايە لە قەرەباڵغيدا.

[2] دسوقی: ناوی "ئيبراهيم"ە، ئەميش يەكێكە لە گەورەی سۆفييەكان، قەبرەكەی لەشاری "دسوق"ە لەميسر، خەڵكان بەتايبەت دەچن بۆ سەر قەبرەكەی، وە مزگەوتێكی بەسەر قەبرەكەيەوە دروست كراوە .

"سەلامی خودایان لێبێت"، لەبەر ئەوەی صەحابە دەیان زانی کە پێغەمبەر (ﷺ) مرۆڤێکەو بەدەستی نیە بۆئەوان هیچ تواناو ئاسان کردن و لابردنی ناڕەحەتییەك لەسەریان، بەڵکو تەنها پەنایان برد بۆلای خوای پەروەردگار، وەخوای گەورەو میهرەبانیش لە پاداشتی ئەوەدا دەست بەجێ وەلامی دانەوە، بەناردنی هەزار جەنگاوەر لە فریشتەکان "ملائکة" کۆمەك و یارمەتی کردن، کە دەفەرموێت ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ﴾، واتە: کاتێك ئێوەی موسوڵمان هاناو پەناتان بۆ پەروەردگارەکەتان دەبردو داوای کۆمەکی و یارمەتی دانتان لێ دەکرد (پێش ئەوەی شەڕ دەست پێ بکات و گەرم ببێت، وە لەشکری بێ باوەڕەکانتان بینی کە چەندە زۆر بوون کە "٩٥٠" کەس بوون، وە ژمارەی موسوڵمانەکانیش "٣١٣" کەس بوون)، وە زانیتان جگە لە ڕووبەڕوو بوونەوەی کافران و شەڕ لەگەڵ کردنیان هیچ ڕێگایەکی تر نیە، هاوارتان کردە خوداو لێی پاڕانەوە، وەلەپاداشتی ئەو هۆمەن بردنەتان بۆ لای خودا [1] ﴿فَٱسْتَجَابَ لَكُمْ﴾، واتە: خودا وەلامی نزاو پاڕانەوەکەی

[1] لەجەنگی بەدردا موسوڵمانەکان بۆ شەڕکردن نەچوو بوون، بەلام کە قوریش بەسوپایەکی گەورەوە هات بەرەو ڕوویان، ئەمجا موسوڵمانەکان بۆیان یەك لا بۆیەوە کە دەبێت بەرەنگارییان ببنەوە، ئەوە بوو پێش دەست پێکردنی جەنگ موسوڵمانەکان دەستیان کرد بەپاڕانەوە لەخوا تا سەریان بخات و یارمەتیان بدات، ووە کۆمەکیان بکات و بێت بەهاوارییانەوە، چونکە موسوڵمانەکان لەیەك لەسەر سێی کافرەکان ژمارەیان کەمتر بوو، وە لەپێش هەموو موسوڵمانەکانیشەوە پێغەمبەر (ﷺ) خودی خۆیشی دەستی کرد بە پاڕانەوەیەکی بەکوڵ لەخودا، لەناو ئەو خێمەیەی کەوەکو سەرکردەیەکی سوپا بۆیان هەڵدابوو، ئەوەندە بەکوڵ لەخودا

دانــــەوە بـــەوەی ﴿أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُرْدِفِينَ﴾، واتـە: مـن كۆمەكی ئێـوە دەكـەم و یارمـەتیتان دەدەم بە نـاردنی هـەزار فریشتەی هەڵبژێراو ناودار، كە بەریز و بەشوێن یەكدا و یەك بەدوای یەكـدا دێـن﴿وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِۦ قُلُوبُكُمْ﴾، وەپەروەردگار بەناردنی ئەو فریشتانە بۆ كۆمەكی كردنتان،ووە بۆ ئەوە بوو تا ببێ بە مـژدە بـۆ سـەركەوتنتان، وە بـۆ ئـەوەی دڵتـان دابمـەزریو ئارام بگـرێ، وە ترسـی زۆریو بـەهێزی دوژمنانتـان لەدڵتانـدا نـەمێنێ. ﴿وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾(الانفال:٩-١٠)، واتـــە: بێگومـــان ســـەركەوتنی ڕاســـتی لەجەنگـــدا هـــەر لای پەروەردگارەوەیـــە، وە بەدەســـت كـــەس نییـــە بێجگـــە لـــەخودا نـــەبێ، نەفریـشتە نـە غـەیری فریـشتە بـەبێ ڕەزامەنـدی خـودا یارمەتیـدانو سـەركەوتنیان پـێ ئـەنجام نـادرێ، هـەموو كارێـكو یارمـەتی دانێـك

---

دەپاڕایەوە،ووە ئەوەندە دەستی زۆر بەرز دەكردەوە بۆ ئاسمان عاباكەی سەرشانی زوو زوو دەكەوتـە خـوارەوە، ئیمـام ئـەبو بـەكر بـۆی هـەڵ دەگرتـەوەو دەی دایـەوە بەسەر شانیدا، وە دەی فەرموو(ﷺ): (خوایە ئەگەر ئەمڕۆ ئەم كۆمەڵە موسوڵمانە كەمـە لـەناو بـچێ ئیتر لەسـەر زەویـدا، كەسـانێك نابێـت بە تـەنها تـۆ بپەرسـتێ)، بێگومـان موسـوڵمانەكانیش بـەكوڵو بـەدڵ داوایـان بـەس لـەخوا دەكـرد وەكـو پێغەمبەرەكەیان، هـەتا خـوا خـەرێكی كـەمی بەسـەر پێغەمبـەردا هێنـا كە خەبـەری بویـەوە بەمـژدەوە، مژدەی سـەركەوتنو كۆمـەكیو یارمـەتی خوایی بەموسـوڵمانان ڕاگەیاند، بەهاتنی هەزار فریشتە بەسەركردایەتی جوبرەئیل كە بەڕێگەوەن بۆ پاڵ پـشتی كردنـی موسـوڵمانەكان، ئەمــەش تــەنها لەپاداشـتی پاڕانــەوەو داواكردنــی یارمەتی بوو تەنها لەخودا.

لەڕاستیدا تەنها خودا دەیکاو دەی خوڵقێنێ، بەڕاستی " الله" خودایەکی خاوەن توانایە،ووە خاوەنی حیکمەتەو کاربەجێیەو کاری بێ ئەنجام ناکات.

## ٢- داواکردنی یارمەتی لە غەیری خودا : طلبُ المدد من غیرِالله

هەندێ لە خەڵکی داوای یارمەتی لە غەیری خودای بەرزو بڵند دەکاتو دەڵێت: "ئەی پیاوچاکانی خودا یارمەتیم بدەن" یاخود دەڵێت: "ئەی بەدەوی یارمەتیم بدە"، وە وێنەی ئەمانە[1].

وە ئەمەش دروست نییە، لەبەر ئەوەی وشەی "المدد" واتە: داواکردنی هاوکاری کردنو یارمەتی دانە، وە ئەم دووانەش داواناکرێن جگە لە خوای پەروەردگار نەبێ، لەبەر ئەوەی هیچ کەس توانای بەسەر ئەم دووانەدا نیە جگە لەخودا نەبێت، وە لەبەر ئەوەیشە خوای گەورە لەبارەی داوای بەفریاکەوتنەوە "المدد" دەفەرموێت﴿كُلًّا نُمِدُّ هَٰؤُلَاءِ وَهَٰؤُلَاءِ مِنْ عَطَاءِ رَبِّكَ﴾ (الاسراء: ٢٠) واتە: پەروەردگار هەردوو کۆمەڵی: دونیا ویستانو قیامەت ویستان لەیارمەتیو بەخشینی خۆی لەڕزقو ڕۆزیو منداڵو سامان بێ بەش ناکات، وە هەرکەس بەگوێرەی خۆی (کافربێ یان موسوڵمان) ڕزقو ڕۆزی دەداتێ، وەماڵو منداڵی پێ دەبەخشێت.

وەلەبارەی یارمەتی دانەوە "العون" دەفەرموێت: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ (الفاتحة:٥)، واتە: خوایە بە تەنها تۆ "إيّاك" دەپەرستین "نعبُدُ" وە بەندایەتی تەنها بۆ تۆ دەکەین، وە لەتۆ زیاتر

---

[1] وەکو بڵێت: " ئەی کاك ئەحمەدی سلێمانی" یاخود "ئەی شێخ عبدالقادری گەیلانی" بێن بەهاوارمەوە.

ملكەچی كەسی تر نابین، وە هەروەها بە تەنهایش هەر لەزاتی پاكی تۆ "إيَاك" داوای كۆمەكی و یارمەتی دەكەین "نستعين"، وە بەتەنها پشت بەزاتی تۆ دەبەستین، جگە لەتۆ پەنا بۆ هیچ كەس و شتێك نابەین، جا چ زیندوو بێ یاخود مردوو، چونكەلە تۆ زیاتر زاتێكی تر نییە كە خاوەنی دەستەلآت و توانایەكی بێ سنوور بێ لەم بوونەوەرەدا.

وە لەلای ئیمامی "ترمذي" فەرموودەیەك هاتووە بە سەنەدێكی صەحیح، كە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی بە "إبنُ عباس" — ڕەزای خوای لێ بێت— : " إذا اسْتَعَنْتَ فَآسْتَعِنْ بِاللهِ"[1]، واتە: ئەگەر داوای كۆمەكی ویارمەتیت كرد، تەنها داوای كۆمەكی و یارمەتی لە خوا بكە.

وە لە" صەحیحی موسلیم" دا فەرموودەیەك هاتووە: كە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : " اِحْرِصْ عَلَى مايَنْفَعُكَ، وآستَعِنْ بِاللهِ "[2]

واتە: سوور بە لەسەر ئەوشتە كەسوودت پێ دەگەیەنێت، وە پشت بەخوا ببەستە.

وە لەلای ئیمامی "ابی داود" یش فەرموودەیەك هاتووە بەسەنەدێكی صەحیح[3] كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی بە "موعاذی كوڕی جەبەل" – ڕەزای خوای لێبێت– : " إنّي لأُحِبُّكَ، فلا تَدَعْ في دُبُرِ كُلِّ صلاةٍ أن تقول: اللهُمّ أعنّي على ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ وحُسنِ عبادَتِكَ".

---

[1] حديثٌ حسن: رواه الترمزي: لە (صفة القيامة) دا (٤/٦٦٧) بە ژمارە (٢٥١٦) وە فەرموویەتی: حسنٌ صحيح.

[2] حديثٌ صحيح: مسلم (٤/٢٠٥٢) بەژمارە (٢٦٦٤)

[3] حديثٌ صحيح: رواه ابوداود (٢/٧٦) بە ژمارە (١٥٢٢)

واتە: بەڕاستی ئەی موعاذ من تۆم خۆش دەوێت، بەجێی نەهێڵی ئەم ذیکرە لەدوای تەواوبوونی هەموو نوێژێك کە بڵێی (اللهُم اَعنّي على ذكرك وشكرك وحسنِ عبادتك)، واتە: خوای پەروەردگار یارمەتی دەرم بە لەسەر یادکردنت، و وەسوپاس‌و ستایش کردنت، وە بەچاکی پەرستنت[1].

---

[1] هانابردن بۆ مردووان‌و داوای کۆمەکی کردن لە غەیری خودا:

-خوێنەری بەڕێز لە کوردستانی ئێمەدا هانابردن بۆ غەیری خودا زۆر زۆرە، کە بەئەندازەیەك لەوە دەچێت هیچ گەلێکی تر نەبێت بەوێنەی خەڵکی ئێمە ئەم جۆرە دیاردەی تیابێت، هۆکارەکەیشی دەگەڕێتەوە بۆ بوونی کۆمەڵێکی زۆر لە قەبری پیاوچاکان، کە بەو قەبرانە دەوترێت "شەخص" کە ئەم شەخصانە ئەوەندە زۆرن شارو لادێیەك نییە ئیللا دەبێت شەخصێکی تیابێت، بەڵکو قەبرستانێك نییە ئیللا دەبێت لەناو ئەو قەبرانەدا بەلایەنی کەمەوە دەبێت قەبرێکی تیا بێت کە ڕەنگی سەوز کرابێت،و پەڕۆو ئاڵای سەوزی بۆ چەقێنرابێت‌و بشەکێتەوە،ووە لەناو پەڕۆ سەوزەکانیشدا دەستێك لە ئاسن دروست کرابێت‌و ڕەنگی سەوزی تۆخ کرابێت، تا ئەم شتانە بەڵگە بن لەسەر ئەوەی کە ئەم خاوەن قەبرە شێخەو وە قەبرەکەیشی شەخصە، وە هەروەها بۆ هەموو شەخصێك قەبرەکەی ڕەنگی سەوزی تۆخ کراوە،ووە پەڕۆی سەوز لە بچووك‌و گەورە بۆی کراوە بە ئاڵا بۆ ئەوەی هەر لەدوورەوە خەڵکی بی دۆزێتەوەو، وە هیلاك نەبن‌و بگەڕێن بەدوای ئەم جۆرە قەبرانەدا، وە زۆر بەی ئەم قەبرانەش چواردەورەیان بە بەرد بۆ کراوە وەکو شورا،و وە کەمێکیشان چەتریان بۆ کراوەو وە ناوەکەیان وەك دیوەخان رازێنراوەتەوە، کە چوویتە ناویەوە حەز ناکەی بێیتە دەرەوە ، وە زۆربەشیان ناوی تایبەتیان بۆ دانراوە، وەکو: ئەمە شەخصی کانی بایە، ئەمەی تریان کاسەو کەوچکە، ئەوەی تریان ئەلیاسە فرەیە، یەکێکی تر تەڕاتەوەنە،وو شێخی کۆنە پۆش ، و ...... تاکۆتایی .

وه هەندێکیشیان خەڵکی بۆی دیاری کردوون کە ئەم شەخصە بۆچی باشە، بۆ نموونە: ئەم شەخصە بۆ شەلەل باشە، ئەوی تر بۆ نەخۆشی "بایەری" باشە، یەکێکی تر بۆ منداڵ بوون، ئەوی تریان بۆ نیاز قبوڵ بوون و شووکردن باشە.

وه بۆ شەخصە گەورەکان و زۆر پیرۆزەکانیش خزمەت کاریان هەیە، کە پێیان دەوترێت "زێوان" وه ئەم زێوانانە ئەرکی خزمەتکردن و پاککردنەوەو بەڕێکردنی خەڵکی کە دێن بۆ زیارەتی ئەم شەخصانەیان لەخۆگرتووه، وه ڕۆژێکی تایبەت بۆزیارەت کردنی ئەم قەبرانە دانراوه، کە دەڵێن لەڕۆژی ٤ شەممماندا باشە بچیت بۆ سەر قەبری شەخص ، بۆ؟ چونکە ٤ شەممان ڕۆژێکی پیرۆزەو بەڵکو باشترو زووتر نیازەکانت قبوڵ بێت و بێتە جێ.

وه هەندێك لەو شەخصانە ئەگەر خاوەنەکەی بەناوبانگ بێت سەر قەبرەکەی وەکو گەلای دار پڕ کراوه لە پاره ، یاخود شەخصی وا هەیە خەڵکی بەرماڵە دڕاوی ماڵی خۆیانی بۆ هێناوەو لە کێلی قەبرەکەیانەوه پێچاوه، وه سەر قەبرەکەیشی پڕکراوه لە قاپ و قاچاغی شووشە ووه شکاندویانە بەسەر قەبرەکەیدا ، بۆ؟ چونکە دەڵێن: ئەم شێخە شێخی کۆنە پۆشە دەبێت چوار دەوریشی بەکۆنە پۆشرا بێت.

هەندێکی تر لەو شەخصانە مزگەوتیان بەسەرەوه کراوەو گومەزی گەورەی سەوزیان بەتایبەت بۆ نەخشێنراوه، وه هەریەکەیان ناوی خۆی هەیەو بەدەرگای دەرەوەی شەخصەکەدا هەڵواسراوه.

لەوه سەیر تر ئەوەیە هەموو شەخصێك دەبێت لەگەڵ پەڕۆ سەوزەکاندا ئەو دەستە ئاسنە سەوزەیشی لەگەڵدا هەبێت، پرسیار بکەی لای هەندێك لەخەڵك باوەڕیان وایە ئەو دەستە زیاتر ئەم قەبرە پیرۆز تر دەکات، چونکە دەڵێن: ئەو دەستە دەستی پێغەمبەره!!، ئیتر نازانم ئایا پێغەمبەر ئەوەندە دەستی هەبوو تا بەشی ئەو هەموو شەخصانە بکات، یان پێغەمبەر دەستی وەکو دەستی مرۆڤ لەگۆشت بووه یان لەئاسن، وه ئایاهیچ شوێنێك نەماوه دەستی پێغەمبەری پیادا هەڵبواسرێت ئیللا لە قەبرساندا نەبێت.

ئەمە وەکو پێشەکییەك تا بزانیت کە قەبر پەرستی چەند لای ئێمە گرنگی پێدەدرێت، ئەوەندەی بەمردووەکان گرنگی دەدرێت بەزیندووەکان ئەوەندە گرنگی نادرێت.

بەڵام هاوارکردن لێیان و پەنابردن بۆیان زۆر زۆرە، بەڵام لێرەدا باسی هەندێك لەو جۆرە هانابردنانە دەکەین:

- شەخصێك هەیە لەنزیکی سنووری ئێران، خەڵکی ئەگەر منداڵیان تووشی سووریژە ببێت، دەچن گڵی ئەو شەخصە دەهێنن و دەرخواردی منالەکەیانی دەدەن، بەهیوای ئەوەی ئەم گڵە سووریژەکەی چاك بکاتەوەو شیفای بدات.

- یاخود هەندێك کەس کە دەچێت بۆ سەر شەخص موفەرکێکی ئەو شەخصە، کە پارچەیەك پەڕۆی سەوزە یان پارچەیەکە لە دارەکانی ئەو شەخصە ، یان بەردێکی سەر قەبرەکەی دەهێنێت و دەیخاتە ناو خواردەمەنی و زەخیرەی ماڵەکەیەوە، بەهیوای ئەوەی کە ئەو شتەی ئەو شەخصە بەرەکەت بخاتە ناو خواردەمەنی ماڵەکیانەوە،و وە زەخیرەی ماڵەکەیان ئەو پارچە شتەی ئەو شەخصە زیادبوونی پێبکات.

- یاخود هەندێك لە خەڵکی لەماڵەوەیان شەکر دەبات بۆ سەر شەخصێك، وە لەدواییدا لەگەڵ خۆیدا دەی هێنێتەوە بۆ پیرۆزی، بەحسابی ئەوەی مادەم ئەو شەکرە براوەتە سەر ئەو شەخصە بەرەکەتی وەرگرتووە،ووە لەگەڵ خۆیدا بەرەکەتی هەڵگرتووە.

- یاخود هەندێك لە خەڵکی کە منداڵەکەی نەخۆش کەوت، دەچێت پارچەیەك موفەرەکی بۆ دەهێنێتەوە،وە دەیکاتە دەستی منداڵەکەی بەهیوای ئەوەی ئەم موفەرەکە شیفای بدات.

- یاخود هەندێك لە ئافرەتان ئەگەر بەمنداڵەوە بوو، وە منداڵەکەی لێ نەبۆوە دەچن موفەرەکی شەخصێکی بۆ دەهێنن و،وەکو پشتێن بەناو قەدیەوە دەی بەستن تا منداڵەکەی بە پیرۆزی ئەو موفەرەکەوە لێ ببێتەوە.

- یاخود هەندێ لە خەڵکی کە منداڵێکیان تووشی نەخۆشییەکی سەخت بووە، ئەوا ئەو منداڵە دەبەن بۆ سەر شەخصێك، پاشان تا ماوەیەك لەسەر ئەو شەخصە

دەمێننەوە، چاوەڕێ دەکەن بەڵکو منداڵەکەیان خەوی لێ بکەوێت، ئەگەر خەوی لێکەوت، ئیتر دەڵێن: تەواو ئیتر چاك دەبێتەوەو شیفای بۆ دێت، بەڵام ئەگەر خەوی لێ نەکەوت ئەوا بێ هیوا دەبن لەچاك بوونەوەی.

- یاخود هەندێك لە خەڵکی کە منداڵیان نابێت، هۆمەن دەبات بۆ شەخصێك و لێی دەپاڕێتەوە کەوا منداڵێکی ببێت، وە دەڵێت: شەخصەکە گیان!! ئەگەر منداڵێکم بوو بانیشانەیەکی خۆتی پێوە بێت، بۆیە ئەگەر منداڵێ خاڵی زۆری پێوەبێت، ئەوا بەو منداڵە دەڵێن: ئەوە دایکت چووەتە سەر شەخص ئەمجا تۆی بووە، وە ئەو خاڵانەش نیشانەی ئەو شەخصەیە بەتۆوەیە.

- یاخود هەندێك لە خەڵك کە منداڵیان زۆر نەخۆش دەبێت، دەیبەن بۆ سەر شەخصێك و دەڵێن: ئەم شەخصە خوێنی لە خۆی گرتووە، دێن حەیوانێکی بۆ سەر دەبڕن تا منداڵەکەیان چاك ببێتەوە.

- یاخود شەخصێکی لێیە لە گردی "......." هەندێك لە ئافرەتان ئەگەر کەسێکیان ون بووبێت دەچنە سەر ئەو شەخصە، داوا دەکەن لەم شەخصە تا سۆراخ و هەواڵی ئەم کەسەیانیان بۆ بزانێت، چۆن؟ دێن پەڕەیەك کاغەز دەهێنن و لەسەر ئەو پەڕە کاغەزە داواکەیان دەنووسن، بەم شێوەیە: ئەی شێخ فلان گیان! داوات لێدەکەم کە تۆ پیاو چاکی ووە لەخواوە نزیکی کە تکایەکمان بۆ بکەی لای خوا، بەڵکو هەواڵی ئەو فلان کەسەمان بۆ بێت و بزانین چی بەسەر هاتووە، ئەمجا داواکە دەخەنە ناو فایلێك و دەیدەن بە دەستی زێوانەکەی شەخصەکەوە ،ئەویش دەیبات لەسەر قەبرەکەی دای دەنێت، بە باوەڕی ئەوەی کە کاکی شێخ ئەم داوایەیان لای خوا بۆ جێ بەجێ بکات.

- یاخود هەندێك لە ئافرەتان کە منداڵیان نابێت، کە دەچنە سەر قەبری شەخصێك تا داوای منداڵ بوونی لێ بکەن، دێن ئەم ئافرەتانە پەڕۆیەکی سەوزی ئەو شەخصە دەهێنن و ئەمجا هەر چوار لاکەی بەچوار پەلەدارێکی ئەو شەخصەوە دەبەستن، پێی دەڵێن: جۆلانە دروست کردن، پاشان ئەو ئافرەتانە ئەو جۆلانەیە بەجێ دەهێڵن تا هەفتەیەك یان دوو هەفتە، کە لەدوای ئەو ماوەیەوە دەچنەوە سەری و سەر لەو جۆلانە دەدەن، ئەگەر هەر چییەك کەوتبێتە ناو ئەو جۆلانەوە، دەبێت ئەو ئافرەتە

که منداڵی نابێت دەبێت بی خوات بۆئەوەی منداڵی ببێت، ئیتر ریقنەی چۆلەکە بێت یان چۆلەکە تۆپیوو بێت یان هەر چیەك بێت دەبێت بیخوات، ئەگین بە باوەڕی ئەوان منداڵەکەی نابێت ئیتر، یاخود لەدوورەوە بەردێکی ئەو شەخصە فڕێ دەدەن بۆ ئەو جۆلانەیە، ئەگەر بەردەکە کەوتە ناویەوە ئەوا دەڵێن: وەك چۆن ئەو بەردە کەوتە ناو ئەو جۆلانەیەوە ئاوا تۆیش منداڵێك دەکەوێتە سکتەوە.

– یاخود مامۆستای بەڕێزو موفەسیری قورئان "مامۆستا مەلا مەحمودی گەلاڵە" لە تەفسیرەکەیدا "تەفسیری ڕەوان" دیاردەیەکمان بۆ دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێت: لەشاری سلێمانی دارێك هەبوو لە مزگەوتی گەورەدا، نزیك ئارامگای "کاك ئەحمەدی شێخ" خەڵکی بە پیرۆزیان دەزانی، لەدوای ساڵی ١٩٦٥ کە مزگەوتەکە تازە کرایەوە دارەکەش سەری تیا چوو، بەڵام تا ساڵی ١٩٧٨ کۆلکەدارەکەی بنکی مابوو، خەڵکی تەلاش تەلاش لێیان دەکردەوە بۆ موفەرەك، تەنانەت من بۆ خۆم بەچاوی خۆم بینیومە پرو پیرێژن زەویەکەیان بۆ هەڵدەکۆڵی، بۆئەوەی بە ئەندازەی نینۆکێکیان لە بنە تۆڵەکەی وەگیر بکەوێت بۆ ددان هێشەو سك هێشەو منداڵبوون و ئەمجۆرە شتانە بەکاریان دەهێنا، چونکە بە موفەرەکیان دەزانی! باش بوو لە دەوروبەری ساڵی ١٩٨٣ دا شوێنەکەیان کۆنکرێت و کاشی کردو ئاسەواری نەماو لەبیرچوەوە.

– یاخود لە هەندێك شوێن ئەوەندە زیادەڕەوی لە پیرۆز کردنی ئەو شێخانەدا کراوە، کە دەڵێن: لە هەندێك شوێنی کوردستان بەردی خڕی گەورە گەورە لێیە ووە خەڵکی ئەو بەردانە بە پیرۆز دەزانێت ، بۆ ؟ چونکە دەڵێن: ئەو بەردانە فلانە شێخ وەختی خۆی کە خەڵکی ئێرە بووە،کە کاتی نوێژ هاتووە چوەتە سەر ئەم بەردانەو،ئەمجا دیار نەماوە و ڕۆیشتووە بۆ شاری مەککەو لەوێ نوێژە فەرزەکانی بەجێ هێناوە، بەڵام بێگومان ئەوشێخانە زۆرینەیان پیاوچاك بوون کە بۆ ژیانی دونیایان،وەیاخود بۆ دوای مردنیشیان بەو زیادەڕەوی کردنە لە پیرۆز کردنیاندا ڕازی نەبوون .

– یاخود هەموو ساڵێك لەشاری سلێمانی لە مانگی چواردا دیار دەیەك پەیدا دەبێت، کە دوکانی ئیستینساخەکان بۆ پارە پەیدا کردن زیندووی دەکەنەوە

بەناوی" وەسیەتی شێخ ئەحمەد"ەوە ،کە ئەم وەسیەتە درۆیە کە لە یەك پەڕە کاغەز پێك هاتووە،و بە (٢٥٠) دینار چاپی تەبع دەی فرۆشن، کە کورتەکەی بەم شێوەیە:
من ناوم شێخ ئەحمەدەو خادمی قەبرەکەی پێغەمبەر بووم، شەوێك وەنەوزم دەدا پێغەمبەر هاتە بەرچاوم یان هاتە خەوم،و ووتی: ئەی شێخ ئەحمەد!! وەسیەتێکت بۆ دەکەم وتۆش بە ئومەتەکەمی ڕابگەیەنە، کە ئومەتەکەم لەڕێی خودا لایان داوەو وە هەفتەی چل هەزار کەسیان بەکافری دەمرنو.... هەتا کۆتایی ، پاشان پارە پەیداکردن بەم وەسیەتەوە،ووە قوڵ بڕینەکە ئـــا لەمەدایە دەڵێ: پاشان پێغەمبەر پێی ووتم: دەبێ ئەم وەسیەتە هەرکەس خوێندیەوە، دەبێت حەوت نوسخەی لێ بنوسێتەوەو وە بەسەر خەڵکیدا دابەشی بکات ئەگەر وانەکات ، سەیر بکە خوێنەری بەڕێز ئەم فێڵە ئەو سزایانەی کە هێناویەتی بریتین لەو سزایانەی کە هەر کەسەو وە هەر چینە لەچی دەترسێ ئەو سزایانەی بۆهێناون، دەڵێت: ئەگەر نەی نوسێتەوە ئەگەر ژن بوو تەلاق دەدرێت، وە ئەگەر پیاو بوو ژنەکەی تەلاق دەدات، بەلام بی نووسێتەوە ئەگەر کچ بوو شوو دەکات، وە ئەگەر کوڕ بوو ژن دەهێنێ، وە ئەگەر بینوسێتەوە ئەگەر فەقیر بوو دەوڵەمەند دەبێت، بەلام نەی نووسێتەوە ئەگەر دەوڵەمەند بوو فەقیر دەبێت، ئەگەر بێ ئیش بوو ئیشی دەست گیر دەبێت ، بەلام نەی نووسێتەوە لەوەزیفەکەی دەری دەکەن.
پاشان خەڵکی داماو کە یەکێك ئەو وەسیەتەی دەداتێ و دەی خوێنێتەوە ، ئیتر لەترسا بۆئەوەی تووشی ئەم نارەحەتیانە نەبێت، دەبێت ٧ نوسخەی لێ ئیستنساخ بکاتو بەسەر خەڵکیدا دابەشی بکات، کەواتە ناحەقی نی یە کابرای دوکانی ئیستنساخ هەموو ساڵێ زیندووی بکاتەوە بۆ بەرژوەندی خۆی.
بەلام ئەم وەسیەتەی "شێخ ئەحمەد" درۆیە،ووە لەشاری مەککەو مەدینەشدا پێش ٣٥ ساڵ لە مەو پێش هەبووە لەناو ئەوانیشدا، کە زانای پایە بەرز " شێخ بن باز" لەساڵەکانی حەفتادە ڕەتی داوەتەوەو دەڵێت: ( ئەم وەسیەتە درۆیە و وە هیچ ئەصڵێکی نییە)، بەلام تازە دەگات بەکوردستانی ئێمە.
پاشان بزانە خوێنەری بەڕێز بە چەند ساڵێك ناوی خاوەن وەسیەتەکە دەگۆڕن جاران ناوی شێخ مستەفا بوو، پاشان بەناوی کچێکەوە بلاویان دەکردەوە کە خەوی بە سەیدە زەینەبی کچی پێغەمبەرەوە بینیووەو هەمان وەسیەتی پێی وتووە، وە ئەمە دووساڵیشە بەناوی شێخ ئەحمەدەوە بلاوی دەکەنەوە، ئیتر خوادەزانێ دەبێ بەشێخ کێی تر، وە ئەگەر دەتەوێت باشتر ئەم درۆیەت بۆ ڕوون بێتەوە ، ئەوا ئەم

## ٣- سەربڕینی ئاژەڵ بۆ جنۆکە : الذبحُ للجِن

لەنێو خەڵکیدا کەسانێکی وا هەیە، دەچێت بۆ لای جادووگەرێك "ساحیر" تا چارەسەری نەخۆشیێکی بۆ بکات،ئەمجا جادووگەرەکەش بۆ ئەنجام دانی جادوو وسیحرەکەی داوای ئاژەڵێکی لیَ دەکات[1] ، کە چەند سیفاتێکی جۆراو جۆرو دیاری کراوی هەبێت، بۆ نموونە (مریشکێکی ڕەش بێت سپیایی تیادا نەبێت)، وە وێنەی ئەمانە، پاشان

---

وەسیەتەی کە تۆزێکی تر بەرچاوت دەکەوێت،هەر ئەو وەسێتەیە کە (٥) ساڵ لەمەو پێش بەناوی ئەو کچەوە کە خەوی بە سەیدە زەینەبەوە بینیوە بڵاویان کردۆتەوە، وە ئەم وەسیەتە هەر ئەو نوسخەیەیە کە پێش (٥) ساڵ لەمەو پێش لە خەڵکی وەرم گرتووە، فەرموو سەیری بکە:



من کچێکم تەمەنم (١٢) ساڵە تووشی نەخۆشیەك بووم ،هیچ دکتۆرێك نەیتوانی چارەسەری نەخۆشیەکەم بکات بۆیە ڕۆیشتم بۆ زیارەتی مەرقەدی ﴿سەیدە زەینەب﴾لە خەومدا ئاوم خواردەوە بە ڕەحمی خودای گەورە و میهرەبان، چاك بوومەوە ،بەلام ﴿سەیدە زەینەب﴾ڕای سپاردم ئەم ڕووداوە بنووسمەوە بەسەر هاولاتیاندا دابەشی بکەم منیش نووسیمەوە ، دام بە پیاوێکی هەژار پیاوەکە دەستی کرد بەدابەش کردنی دوای(١٢)ڕۆژ دەوڵەمەند بوو ،دای بە پیاوێکی تر پیاوەکە قسەکەی لە پشت گوێ خست دوای(١٢)ڕۆژ کەوتە بەندیخانە ،دام بە کچێك تەمەنی (١٩) ساڵ بوو ، ڕووداوەکەی نووسیوە دوای(١٢)ڕۆژ شووی کرد ،دام بەکوڕێکی موزەف فەرمانەکەی پشت گوێ خست دوای (١٢)ڕۆژ وەزیفەکەی لەدەستدا ئەوا واجبە لەسەر هەرکەسێك ئەو ڕووداوە بنوسێتەوە دوای دابەشی بکات بەسەر هاولاتیاندا ،دوای (١٢)ڕۆژ بەئەمری خودای گەورە و میهرەبان هەر چیەك لە دڵیدا بێت جێ بە جێ دەبێت ،ئەوەی پشت گوێ بخات دوای(١٢)ڕۆژ کارەساتێکی گەورەی بەسەر دێت

انشاالله حەمدو خێرو سەلامەتی بۆ ئەم ڕووداوە

---

[1] زۆرینەی خەڵك لە نەزانینەوە ئەم کارە دەکەن ، چونکە ئەگەر بزانن ئەو حەیوانەی کە جادووگەرەکە وەری دەگرێت لێیان ، بۆ ڕازی کردنی جنۆکە سەری دەبڕێ، ئەوا ڕازی نەدەبوون بەو کارە.

جادووگەرەکـە مریـشکەکە سـەر دەبـڕی ووە لاشـەی نەخۆشـەکەی پـێ خوێناوی دەکا،وە بۆ ڕازی کردنی جنۆکە ئەم کـارە ئـەنجام دەدات، لەبەر ئەوەی جنۆکە بەخوێن دەژی و وە لەسەر خوێن خۆراك خۆری دەکات، وە ئـەو جادووگەرە لەکاتی سەر بڕینی مریشکەکەدا ناوی خوایشی لەسەر ناهێنێ.

وە ئـەم کـارە کـارێکی یاسـاغو حـەرام کـراوە، وە نـەفرینی لێ کـراوە لـەو کەسەی کە هەڵدەستێ بـەکردنی، بە بەڵگـەی ئـەو فـەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە" ئیمامی موسلیم" گێڕاویەتیەوە، کە فەرموویەتی :

" لَعَنَ اللّٰهُ مَنْ ذُبِحَ لغَيرِ اللّٰهِ، لَعَنَ اللّٰهُ مَنْ لَعَنَ وَالديهِ، لَعَنَ اللّٰهُ من اوى مُحدثاً، لَعَنَ اللّٰهُ مَنْ غَيَّرَ منارِ الارض"[1].

واتە: لەعنەتو نەفرینی خوا لەکەسێ بێت کە حـەیوان سـەر دەبڕێ بۆ غـەیری خـوا، نـەفرینی خـوا لەکەسـێ بێـت کـە نـەفرین لـەدایكو بـاوکی دەکـات، نـەفرینی خـوا لەکەسـێ بێت کـە داڵـدەو پـەنای بیدعـە چییەك دەدا، نـەفرینی خـوا لەکەسـێ بێـت کـە نەخـشەو نیشانەی ناسـینەوەی نێوان دوو زەوی دەگۆڕێت[2].

---

[1] حـدیث صـحیح: لـە (صـەحیحی موسـلیم )دا هـاتووە بـە ژمـارە (١٩٧٨) لـە (الاضاحِي)دا، بابی: تحریم الذبح لغیر الله.

لێرەدا مەبەست بەگۆڕینی "منارُ الأرضِ" : واتـە کەسێك هەڵبستێ بەگۆڕینی ئـەو نیشانە دیاری کراوەی کە نێوانی دوو زەوی پـێ دیـاری دەکرێت، یـاخود گـۆڕینی ئـەو بەردانـەی کـە خـەڵکی سـەریەکی دەنـێن بـۆ ناسـینەوەی ڕێگـاو شـوێنەکانیان، یـاخود ئـەو گۆڕێنـەی کـە حکومەتـەکان هەڵدەسـتن لـەنێوان دەوڵەتەکانـدا دروسـتی دەکەن بەداناانی سنوور بۆیان.

[2] سەربڕینی حەیوان بۆ ڕازی کردنی جنۆکە:

- ئـەم حـەیوان بردنـەی کـە خـەڵکانی جادووگـەر داوای دەکـەن لـە خـەڵکی بـەدیاری بۆیانی بهێنن، هەتا جادوویەکیان بۆ بکەن هەیە لەناو جادووگەرەکانی کوردستاندا،

## ٤–تەرخان کردن و نەزرکـردن[1] بۆ غەیری خوا: النـذرُ لغیـرِ الله

نـەزرکـردن یەکێکە لە خواپەرستییەکان "عبادات" کە پێویستەو واجبە بەکارنەهێنرێ جگە لەبۆ خودا نەبێت، کەوابوو دروست نییە نـەزرکردن نـە بـۆ پێغەمبـەرێك،وە نـە بـۆ پیاو چاکێك، وە نـەبۆ فریشتیەك، وە هـەر کەسێك شتێك نەزربکات بۆ "بـەدەوی" یان "بـۆ دسوقی" یان بۆ جگە لـەم دووانـە[2]، ئـەوا نـەزرێکی حـەرامی بڕیارداوە بیکات، وە پێویست و

---

وە لەدوایشدا ئـەو جادووگـەرە ئـەو حەیوانـە بـۆ ڕازی کردنـی ئـەو جنۆکانـەی کـە سیحرەکەی بۆ بە ئەنجام دەگەیەنن سەر دەبڕێت، بەڵکو هەندێك لە جادووگـەرەکان حەیوانەکە پێش ئەوەی سەری ببڕێت دەی خنکێنێت ئەمجا سەری دەبڕێت، وە ئـەو جادووگەرانە بۆ ئەنجامدانی سیحرەکەیان ئەو جنۆکانـەی کـە کارەکـەیان بۆ دەکـەن چۆن ئـەو جنۆکانـە بیانـەوێت یان داوای هەرچییەك بکـەن ئـەم جادووگـەر بۆیـانی ئەنجام دەدەن.

لە بەرنەوە هەندێك لەو جادووگەرانـە بەمـەرجێك سیحر بۆ ئافرەتـان دەکـەن، دەبێت پێش ئەوەی سیحرەکەیان بۆ بکات کاری ناشـەرعی لەگـەڵ ئـەو ئافرەتانـە دا ئـەنجام بدات، ئەمجا ئەو جنۆکانە سیحرەکەی بۆ بە ئـەنجام دەگـەیـەنێت ،یاخود هەندێك لـە ساحیرەکان هەندێك لە ئایەتەکانی قورئان بە خوێنی عادەی ئافرەت دەنووسنەوە، یـان پـەڕەی قورئـان (دوور لـە قورئـانی پیرۆز) دەخەنـە سـەر شێوەی پێڵاوو لـەپێی دەکەن، یان هەندێکیان قورئان لەگەڵ خۆیدا دەبات بۆ ناو دەستخانەو ئەمجا پـەڕە پـەڕە لـە قورئانەکـەی دەکاتـەوەو خـۆی پـێ پاك دەکاتـەوە ،یـان جنۆکـەکان داوا لـە ساحیرەکە دەکـەن بـە پێـوە بچێتە سـەر قورئـان ،یـان قورئان لەسـەر عـەورەتی بـە بەردەوامی ببەستێ ئەمجا قبوڵ دەکەن سیحری بۆ ئەنجام بدەن.

[1] نەزر: ئەوەیە کەشت لەسەر خۆت فەرز بکەی، یاخود چەند شتێك لەسەر خۆت دیاری بکەی، کە دەبێت بە ئەنجامی بگەیەنێت، کاتێك کە ئەو مەبەستەی کە لەدڵتدا هەیەو بۆت هاتەجێ.

[2] یاخود دروست نییە نەزرکردن نە بۆ هیچ شەخصێك، وە نەبۆ هیچ شێخێك.

واجب نییه وەفا بکات بەکردنی ئەو نەزرەوە،ووە نەزرەکەی بباتە سەرو بە ئەنجامی بگەیەنێت، بەڵکو واجب و پێویستە لەسەر ئەو کەسە کە دەبێت تەوبە بکات لەکردنی ئەو نەزرە حەرامە، وە نابێت جارێکی تر بگەڕێتەوە سەری،ووە ئەو نەزرە بە ئەنجام بگەیەنێت.

لە "صەحیحی بوخاری"دا فەرموودەیەك هاتووە لەدایکمان عائشەوە – ڕەزای خوای لێبێت- : کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: " مَنْ نَذَرَ أنْ يُطِيعَ اللهَ فَلْيُطِعْهُ، ومَنْ نَذَرَ أنْ يَعْصِيَ اللهَ فَلا يَعْصِهِ "[1].

واتە: هەرکەسێ نەزرێکی بڕیاردا،وە مەبەستی بەکردنی ئەم نەزرە، بەدەست هێنانی گوێڕایەڵی و ڕەزامەندی خودابووە، بانەزرەکەی بکاتو گوێڕایەڵی و ڕەزامەندی خوا بەدەست بهێنێ، وە هەرکەسێ نەزرێکی بڕیاردا و مەبەستی بەکردنی ئەم نەزرە سەرپێچی کردنی خودا بوو، با ئەو نەزرە نەکاتو سەرپێچی خوا نەکات.[2]

---

[1] حديثٌ صحيحٌ : رواه البخاري (٥٨١/١١) لە (الايمان والنذور)دا ، بابی: النذر فيما لايملك وفي معصية، ورواه ابوداود: بە ژمارە(٣٢٨٩)، والترمذي: بە ژمارە (١٥٢٦)، والنسائي: بە ژمارە (١٧/٧)، وابن ماجه: بە ژمارە (٢١٢٦).

[2] نەزرکردنی ناشەرعی لای ئافرەتان:

لای خەڵکانی ئێمە نەزری جۆراو جۆر لەسەرخۆیان فەرز دەکەن هەر کەسە بۆ مەبەستێك، وەکو:

- هەندێك لە ئافرەتان کە چووە سەر شەخصێكو وە نیازو مەبەستێکی هەبوو، دەڵێت: شەرت بێت ئەی شەخصەکە ئەگەر ئەم نیازەم بۆ بێتەجێ بەپێی پەتی ئەمجارە بێمەوە بۆ زیارەتت.

- یاخود هەندێك لە ئافرەتان کە نیازێکی لەدڵدا بوو، دەڵێت: خوایە! ئەگەر ئەم کارەم بۆ بێتەجێ، نەزر بێت دوومانگ لەسەر یەك بەڕۆژو ببم.

- یاخود هەندێك لە ئافرەتان ئەگەر نیازێکی هەبێت، دەڵێت: خوایە نەزربێت لەسەرم ئەگەر ئەم نیازو مەبەستەم بۆ بێتەجی، نەزربێت حەوت ماڵ سواڵ بکەم، کە خوای گەورە بەزەیی پیاداهاتەوە،ووە ئەو مەبەستەی کە هەی بووە بۆی هێنایە

**٥- داواکردنی تکاکردن (شەفاعەت) لە غەیری خوا: طلبُ الشفاعة من غيرِ الله[1]**

لەناو خەڵکیدا کەسانێکی وا هەیە داوای شەفاعەتو تکاکردن لە پێغەمبەرێك، یاخود لە پیاو چاکێك دەکات، و دەڵێت: **" ئەی پێغەمبەری خوا شەفاعەتو تکام بۆ بکە "**، یان **" ئەی ئەولیاو خۆشەویستانی خوا تکام بۆ بکەن لای خوا "**.

وە ئەمەش دروست نییە، چونکە شەفاعەتو تکاکردن نابێت جگە لە بۆ خوای گەورە نەبێ، وە پاشان شەفاعەت کردن بۆ کەسێکە کە خوای گەورە مۆڵەتی شەفاعەت کردنی پێداوە، خۆ ئەگەر ویستت شەفاعەتی پێغەمبەر "محمد" (ﷺ) بەدەست بهێنی ئاوا بڵێی: **"اللهُمَّ شَفِّعْ لِيَّ نبيَّك**

---

جنێ، ئەمجا ئافرەتەکە دەچێت عابایەکی کۆن دەدات بەسەریداو حەوت ماڵ دەگەڕێتو سواڵیان لێ دەکات، کە پیان ووت ئەو ماڵانە: بەخوا تۆ ڕەنگت لە سواڵ کەر ناچێت، یاخود کە خۆی چوو بۆ ماڵەکان بۆ سواڵکردن دەڵێت: بەخوا سواڵ کەرنیم!! بەڵام نەزرم کردووە لەسەر خۆم کە حەوت ماڵ سواڵ بکەم، وە دەبێت ئەو پارەیەی کە لەو حەوت ماڵە سواڵی کردووە خۆی نەی خوات بەڵکو بیدات بە هەژارێك.

- یاخود هەندێك لە ئافرەتان کە تووشی ناڕەحەتییەکی زۆر دەبن، دەڵێت: خوایە! ئەم ناڕەحەتییەم لەسەر هەڵبگری، ئەوا نەزر بێت دوای لاچوونی ئەم ناخۆشی یە، نەزربێت ئیتر گوێنی بکەم بە جلو وەئیتر جلی گوێنی لەبەر بکەم.

- یاخو هەندێك لە ئافرەتان کە کوڕیان نەبێت، دەڵێن: خوایە! ئەگەر کوڕێکم پێ ببەخشیت، ئەوا نەزر بێت هەتا گەورە دەبێت جلی تازەی لەبەر نەکەم، بەڵکو هەر بەجلە کۆنە بەخێوی بکەم،یان بەجلی خۆمان بەخێوی نەکەم بەڵکو بەجلە کۆنەی منداڵی خەڵکی بەخێوی بکەم، ، پاشان ئەگەر کوڕی بوو بەدراوسێکانی دەڵێت: من نەزرێکی وام بۆ خوا کردووە، ئەمجا خەڵکی جلە کۆنەی منداڵی خۆیانی بۆ دەبەن تا لەبەری منداڵەکەی خۆی بکات (یاخوا کەس دایکی وا بێ عەقڵی نەبێت).

[1] لە "معارجُ القبول" دا (٢/٢٤).

محمـــداً (ﷺ)"، واتــه: خودایــه شــه‌فاعه‌تی پێغه‌مبه‌ره‌كـه‌تم بـۆ قبـولْ و گیرابكه‌ی .

نه‌كـه‌ی بلێـی: " یـانبيَّ الله اشـفَعْ لـِي "، واتـه: ئـه‌ی پێغه‌مبـه‌ری خـوا شه‌فاعه‌تم بۆ بكه، وه له‌به‌ر ئه‌وه‌یشه كه خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت : ﴿أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُفَعَآءَ﴾[1] واتـــه: یـــاخود ئـــه‌و هاوبـــه‌ش په‌یداكه‌رانه بۆ تێناگه‌ن و بیرناكه‌نه‌وه كه بته‌كانیان كردووه به شـه‌فاعه‌ت كـار بۆخۆیـان لـه غـه‌یری خـواو، وه ده‌ڵـێن: ئـه‌م بتانـه لـه‌لای خـوا شه‌فاعه‌ت و تكامـان بۆ ده‌كـه‌ن، وه سـودمان پـێ ده‌گه‌یه‌نن و زیانمـان لێ دوور ده‌خه‌نه‌وه . ﴿ قُلْ﴾ واته: تۆش ئه‌ی پێغه‌مبـه‌ری خـوا (ﷺ)پێیـان بڵـێ: ﴿أَوَلَوْ كَانُواْ لَا يَمْلِكُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَعْقِلُونَ﴾، واتـــه: پێیان بڵێ ئه‌و بتانه‌ی كه ئێوه ئه‌تانه‌وێ شه‌فاعه‌تتان بۆ بكه‌ن لای خـوا كۆمـه‌ڵێ دارو بـه‌ردی ره‌ق و تـه‌قن، هـیچ شـتێكیان به‌ده‌سـت نیـه، وه‌بـێ عه‌قڵ و بێ هۆشن، ئیتر چۆن بیرو هۆشـتان رێگاتـان پـێ ده‌دات، كه به ته‌مای سوود وه‌رگرتن بن له‌شتێك كه بیستن و بینینی نه‌بێت، وه گیـانی تیادا نه‌بێت، وه نازانن شه‌فاعه‌ت چی یه‌و چی نییه، ته‌نانه‌ت هه‌سـت به په‌رستنی ئێـوه‌ش ناكه‌ن بۆ ئه‌وان. ﴿قُل﴾، واتـه: وه‌تۆ ئه‌ی پێغه‌مبـه‌ر (ﷺ) پێیان بڵێوه به‌و كافرانه ﴿لِّلَّهِ ٱلشَّفَـٰعَةُ جَمِيعًا ﴾ (الزمر: ٤٣-٤٤)، واتــه: تـه‌نها بـۆ خوایـه هـه‌موو شـه‌فاعه‌ت و تكاكردنێـك، كـه‌س توانـای شـه‌فاعه‌ت كردنـی نییـه، تـه‌نها ئه‌وانـه نـه‌بێت كـه خـودا خـۆی مۆڵـه‌تی

[1] لێره‌دا نووسه‌ر ئه‌م ئایه‌ته بۆیه ده‌هێنێته‌وه، تا خوێنه‌ر تێ بگات كه له پێش ئیسلامدا موشریكه‌كان داوای شه‌فاعه‌تیان له بته‌كانیان ده‌كرد، ئـابه‌م شێوه شه‌یتان فریوی دابوون، به‌ڵام كه ئیسلام هات شه‌یتان خه‌ڵكانی به‌شێوه‌یه‌كی تر فریو داوه بۆ داواكردنـی شـه‌فاعه‌ت له غه‌یری خوا.

شەفاعەت کردنیان پیْ دەبەخشیْت تا شەفاعەت بکەن بۆ ئەو کەسانەی کە شایستەن شەفاعەتیان بۆ بکریْ، کەواتە: شەفاعەت لەلاکراو شەفاعەت وەرگرو ریْگادان بە شەفاعەت کردن تایبەتە بە خوای پەروەردگارەوە، بۆ هیچ کەسیْکی تر نییە، چونکە تەنها ئەو خوایەو وە تەنها ئەویش شیاوی ئەو شتانەیە.

وە دەفەرمووێ پاكو بێ گەردی بۆ ئەو: ﴿وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ﴾ (الانبياء:٢٨)، واتە: لەرۆژی قیامەتدا ئەو فریشتانەی کە چەند نزیکن لەخوای گەورەوە، وە چەند بەرِیْزن، وە چەند گویْرِایەڵن، کەچی ویْرانی ئەوەیان نییە کە شەفاعەت بۆ هیچ کەسیْك بکەن، مەگەر بۆکەسیْك کە خوا لیْی رِازی بیْت، وە بەشیاوی دانابیْ بۆ ئەوەی شەفاعەتی بۆ بکریْت.

وە دەفەرمووی پەروەردگار: ﴿يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَرَضِيَ لَهُۥ قَوْلًا﴾ (طـه: ١٠٩)، واتە: لەرۆژی قیامەتدا هیچ شەفاعەتو تکاکردنی کەس سوود بە کەسی تر ناگەیەنیْت، وە هیچ شەفاعەتکارو خاترو خۆتریْك نییە، وە دەرفەتیشی پیْ نادریْ، مەگەر تەنها شەفاعەتی ئەو کەسانە نەبیْت کە خوای بەخشندە خۆی لەوەو پیْش ئیزنو مۆڵەتیان پیْدەدا، وە لەوەوپیْش رِازی بوو بیْت لەقسەو ئاخاوتنو گوفتارەکانیان پەسەند بووبنو خودا لیْی وەرگرتبن.

وە خوای گەورە دەفەرموویْت: ﴿مَن ذَا ٱلَّذِي يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ﴾ (البقرة: ٢٥٥)، واتە: هیچ کەسیْك لەرۆژی قیامەتدا بۆی نیەو بتوانیْت داوای

شەفاعەتو تكاكاریی بۆ كەسێكی تر بكات، مەگەر كەسێك نەبێت كە خودا خۆی بیەوێتو مۆڵەتو ڕێگای پێ بدات.

پاشان هەركاتێ ئەو بەندەی (العبد) خۆی خاوێن ترو دڵسۆزتر كرد بۆ خوا لەكارەكانیدا، ئەوا شیاوتر دەبێت كە شەفاعەتی پێغەمبەر(ﷺ) بەدەست بهێنێ، ئیمامی (بوخاری) فەرموودەیەكی لە (ابی هریرە)وە گێڕاوەتەوە كە فەرموویەتی: وتم : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) كێ بەختەوەرترین كەسە بە شەفاعەتی تۆ لەڕۆژی قیامەتدا؟ فەرمووی: "لَقَدْ ظَنَنْتُ یا ابا هریرةَ أنْ لاتَسألُني عَنْ هذا الحديثِ أحَدٌ اَوْلَى مِنْكَ، لما رأيْتُ من حِرْصِكَ على الحديثِ، اسعدُ الناسِ بشفاعتي يومَ القيامةِ،مَنْ قالَ: لااله الاّ الله. خالصاً من قلبه"[1]، واتە : بەڕاستی ئەی (ئەباهریرە) یەقینم وابوو كە كەسێك لەبارەی ئەوەوە پرسیار لەمن نەكات كە لەپێش ترو شیاوتر بێت لەتۆ، لەبەر ئەوەی من تۆ ئەبینم كە زۆر سووری لەوەگرتنو بەدوادا گەڕانی فەرموودەدا، بەختەوەرترین كەس لەڕۆژی قیامەتدا بەشەفاعەتی منو وەبەر شەفاعەتی من دەكەوێت، كەسێكە كە لەپالاوتەو پاڵفتەی دڵیەوە وتبێتی : لا الـه الاّ الله .[2]

---

[1] حديثٌ صحيح: رواه البخاري له (الرقاق)دا، به ژماره (٦٥٧٠).

[2] ئەم شێوازی تكاكردنە لە غەیری خودا لای ئێمە ئا بەم شێوەیە:

- هەندێ لە ئافرەتان كە دەچن بۆ زیارەتی شەخصێك، ڕووەو قەبری ئەو شێخە دەوەستن، یاخود لەوەستان بەرەو ڕوویدا دەستیش دەگرن بەو چەترە ئاسنەوە كە بەسەر قەبرەی ئەو شێخەوە دروست كراوە،وە دەست دەكەن بە پاڕانەوە لێی، خۆ ئەگەر ئەو كەسە گەرم بوو لەدۆعاكردنەكەیدا دەست دەكات بە ڕاوەشاندنی ئەو چەترە ئاسنە،یاخود دەرگای ئەو چەترە ئاسنە توند ڕای دەوەشێنێتو دەپاڕێتەوەو دەڵێت: یا شێخ فلان گیان! تۆ پیاوی چاكی، توخوا من داوا لەتۆ

٦- تەواف كردنو گەڕان بەدەوری جگە لە كەعبەی پیرۆزدا: الطوافُ بغیرالكعبة.

تەواف كردن پەرستشو عیبادەتێكە لەخواپەرستیو عیبادەتەكان، كە پێویستە ڕواو ڕوو و بەكارنەهێنرێ جگە لە بۆ خوای گەورە نەبێ، هیچ تەواف كردنو گەڕانێك نیەو نابێ ببێت جگە بەدەوری كەعبەی پیرۆزدا نەبێت، خوای گەورە فەرموویەتی:﴿وَلۡيَطَّوَّفُواْ بِٱلۡبَيۡتِ ٱلۡعَتِيقِ﴾ (الحج: ٢٩)، واتە: با حاجییانو موسوڵمانان بە تەنها تەواف بكەن بەدەوری "بیتُ العتیق"دا، واتە: بەدەوری كەعبەی پیرۆزدا كە دێرینو پیرۆزو بەڕێزە.

خۆ ئەگەر هاتوو هەر كەسێك تەواف بكاو بگەڕێت بەدەوری گۆڕی پێغەمبەرێك، یاخود بەدەوری گۆڕی پیاوچاكێك، یاخود بەدەوری جگە لەم دووانەدا، ئەوا ئەو كەسە عیبادەتو پەرستنی خوای داناوە لە غەیری شوێنی خۆیدا، وە بەم گەڕانو تەواف كردنەی كردەوەیەكی كردووە خودا مۆڵەتو فەرمانی پێ نەكردووە، وە لەبەر ئەوە یەك دەنگن زانایان لەسەر ئەوەی گەڕانو تەواف كردن بە دەوری جگە لە كەعبەدا بە مەبەستو نیەتی بە گەورەگرتن و بە گەورە زانینی ئەو شوێنە، ئەوا ئەو كارە شیركو هاوەڵ دانانە بۆ خوای گەورە[1].

---

ئەكەم تۆش داوام بۆ بكە لە لای خوای گەورە. یاخود دەڵێت: تۆ پیاوچاكیو من تۆ دەكەم بە تكاكار لای خوا، بەڵكو خوای گەورە بەهۆی تۆوە ڕەحمیش بەمن بكات،و ئەم كارەم بۆجێبەجی بكات،ووە ئەم ناڕەحەتییەم لەسەر هەڵبگرێت.

[1] تەواف كردن ناشەرعی لای خەڵكی ئێمە:

- هەندێك لەو ئافرەتانەی كە زۆر باوەڕیان بە شەخص هەیەو بە پیرۆزو موقەدەسی دەزانن، كە دەچنە سەر قەبری ئەو شەخصە، دێن بەدەوری ئەو بەردانەی كەوەكو پەرژینێك كراوە بەدەوری ئەو قەبرەدا،دێن بەچواردەوری ئەو بەردانەدا وەك تەواف

### ٧- دەست هێنـان بە قـەبـردا: الـتـمسحُ بـالقبورِ

لەناو خەڵكیدا کەسانێکی وا هەیە دەچێت بۆ سەر گۆڕی پیاوچاکان‌و پیاو پاشان هـەتاوەکو دەست بهێنێ بەگۆڕەکیەداو، وە بەرەکـەتی دەست بکەوێت لێی.

وەئـا ئەمانە هەر هەمووی دروست نییە، لەبەر ئەوەی بەخواکردنی ئەو خاوەن گۆڕەیە، چونکە هەرکەسێك دەست بهێنێ بەدرەختێکدا، یاخود بە بەردێکدا، یا خود بەگۆڕێکدا بەتکای ئەوەی کە بەرەکەتی دەست بکەوێت لێیان، ئەوا ئەو کەسە ئەو شتانەی کردووە بەخوایەکی تر لە غەیری خوای گەورە.

ئیمـامی "ئەحمـەدوترمزی " بەسـەنەدێکی صـەحیح فەرموودەیـەکیان گێڕاوەتـەوە لـە "ابـي واقـد الليثـي"ەوە- ڕەزای خـوای لێبێـت- کـە فەرموویـەتی: لەگـەڵ پێغەمبـەر خودا (ﷺ) بۆ غەزای حونەین (لـەدوای فەتحی مەککە)وە دەرچووین، وە ئێمە تازە کوفرمان بەجی هێشتبوو[1]، ووە تازە موسوڵمان بوو بووین، دامان بەلای شوێنێکدا،کە لەو شوێنەدا موشریکەکان درەختێکیان دیاری کرد بوو لەلای دا مانەوەو وە لەژێریدا دادەنیشتن،وە چەکەکانین پیـادا هـەڵ دەپەسـاند،ووە شمـشێرەکانیان

---

کـردن دەگـەڕێن بـەدەوری دا، بـە مەبەستی ئـەوەی کـە بـۆ چ مەبەسـتێك هـاتوون مەبەسـتەکەیان بێتـە جـێ، وە کەدەچـنە سـەر زیـارەتی ئـەو قـەبرە لـەدوورەوە پێڵاوەکانیان دادەکەنن،و دوایش هـەر بە پـێ خاوسی کە ویستیان بڕۆن بەپاشەو پـاش لەمـەزاری ئـەو شەخـصە دێنـە دەرەوە، چونکە دەڵێن:..نابێت پشتت بکەیتـە شەخصەکە.

[1] مەبەست بەو کەسانەی کە تازە کوفریان بەجێ هێشتبوو: ئەوانە بوون کە لەدوای فەتحی مەککەوە موسوڵمان بوو بوون، کە (ئەبو واقید) یش یەکێك بوو لەوان کە تازە موسوڵمان بوو بوو.

پیـادا هەڵدەواسـی، وە بـەو درەختـە دەوتـرا: "ذاتُ انـواط"، واتـە: درەختێکە جێی ئەوەیە کە شتی پیا هەڵبواسرێت( کە دەکەوێتە نێوان حونـەین ومەککـەوە بـەڵام زۆر نزیکـە لـە مەککـەوە) ، وە ئـەم درەختـەیان بەپیرۆز دادەنا بۆیـە لـەلای دەمانـەوە، وە بڕوایـان وابـوو کـە بەرەکـەتی پێوەیە، بۆیە چەکەکانیان پیا هەڵدەواسی هەتا بەرەکـەتاوی بـن، کاتێك کەتێپەڕین بـەلای ئـەو درەختـەدا، ئێمـەی تـازە موسوڵمان ووتمـان: ئـەی پێغەمبەری خـوا (ﷺ) "ذاتُ الأنواط" یکیش بۆ ئێمە دابنـێ هـەروەکو چۆن ئەو قومە ئەو"ذاتُ الانـواط"ە یـان هەیە، پێغەمبەری خـواش (ﷺ) فەرمووی: (الله اکبر، إنَّها السُّنَنُ، قلْتُمْ- والذي نفسي بيدهِ- كما قالَتْ بنو اسرائيلَ لموسى: اِجعلْ لَنا إلهاً كما لَهم آلهة. قـالَ: اِنّكـم قـومٌ تجهلـون)[1]، فـەرموی: اللّـه اکبر، بەڕاستی ئـەوەی کـە ئێـوە دەیڵـێن هـەر هـەمان ئـەو ڕێبازو ڕێچکەیەیە کە پێشینانتان پیادەیان کردووە، ئەوەی کە ووتتـان – سوێند بەوە ذاتەی گیانی منی بەدەستە- هەر هەمان ئەو قسەیەیە کە (بەنو ئیسرائیل)ی یەکان وتیان بە موسـی، ئـەی موسا: پەرستراوێکی ترمان بۆ دابنێ لە غەیری خوا، هەروەکو چۆن ئەو قەومو نەتەوەیە ئـەو بتـەیان کـردووە بە پەرستراو بۆ خۆیـان، پێغەمبـەر موسـاش پێـی وتـن: بەڕاستی ئێوە گەل‌و نەتەوەیەکن خۆتان نەفامو نەزان‌و گێل دەکەن.

وە هەردوو ئیمامی "بوخاریو موسلیم" فەرموودەیەکیان گێڕاوەتەوە لە ئیمامی "عومـەری کـوڕی خـەتتاب"وە –ڕەزای خوای لـێ بێـت- کاتێـك کـە تـەوافی کـرد بـە دەورەی کەعبـەدا، دەسـتی هێنـا بـە بـەردە ڕەشـەکەدا "حجرُ الاسود"،و وە ماچی کردوو فەرمووی: " أمَا واللهِ اِنّي لأَعْلَـمُ أَنّـكَ

[1] حـدیث صـحیح : رواه الترمـزی ، لـەبابی "الفـتن"دا بـە ژمـارە (٢١٨٠)،و احمـد (٢١٨/٥) ،وقال الترمذي: حسن صحيح

حجـرٌ لاتـضرُ ولاتنفـعُ، ولـولا أنّـي رأيـتُ رسـولَ الله (ﷺ) يُقبِّلـكَ مـا قَبَّلْتُكَ"[1]، واته: بزانه ئەی "حەجەرولئەسوەد" سوێند بێت بەخوا من دەزانم کە تۆ بەردێکیت نەزیان دەبەخشیت وە نەسوود، خۆ ئەگەر من پێغەمبەری خوام (ﷺ) نەبینیایە ماچت بکا منیش ماچم نەدەکردی.

وە شـێخ (حـافظ حکمـي)- خـوا لێـی خـۆش بێـت- لـە هۆنراوەکەیـدا دەفەرمووێت:[2]

هَذا وَمِـنْ اَعمـال اَهْـلِ الشّرك * مِـنْ غَيـرِ مـاتـرّددٍ اوشكِ

واتـە: ئـا ئەمانـەی کـە مـن بـۆ تـۆی بـاس دەکـەم، یـەکێکن لـەکارەکانی خـەڵکانی هاوبەش پەیداکەر، بەبێ ئـەوەی هیچ دوو دڵـی و گومانێکـت تیایاندا هەبێت.

مـايَقْصُدُ الجُهّـالُ مِنْ تَعْظِمِ ما * لـم يـأذنِ اللهُ بِـأَنْ يُعَظِّـمـا

واتــە: ئــەوەی کــەوا خــەڵکانی نــەزان مەبەســتییانە لەبــە گــەورەگرتنی شتانێك، کە خوای گەورە مۆڵەتی نەداوە ئاوا بەگەورە بگیرێن

کـمن يَلُـذَ ببقعـةٍ او حَجَـرِ * او قبـرِ مَيّـتٍ او ببـعضِ الشّجرِ

واتـە: وەکـو کەسـێك پـەنا دەبات بـۆ پارچـە زەوییـەك، یـاخود بـۆ تاقـە بەردێك ، یاخود پەنا دەبات بۆ قەبری مردوویەك یاخود بۆ پارچە دارێك

مُـتَّـخذاً لـذلك المكــان * عِـيـداً كـفعل عـابدي الاوثــان

واته:وە دەیگێڕێ بۆ ئەو شوێنە جەژنۆکەیەك، هـەروەك کـردەوەی بـت پەرستەکان بە ئەنجامی دەگەیەنێت[3]

---

[1] حديث صحيح : رواه البخاري ، له (مناسك الحج)دا به ژماره (١٥٩٧)،و مسلم: له بابی "الحج"دا بەژمارە (٢٠/٥)

[2] بڕوانە پەرتووکی"سُلَّمُ الوصول"

[3] دەست هێنان بەکێلی قەبردا:

- لای خەڵکی ئێمە، کە دەچنە سەر قەبری شێخێك دێن کێلەکەی ماچ دەکەن، یاخود خەڵکی وا هەیە دەست دەهێنێ بە کێلی قەبری شێخێکدا، دوایی ئەو دەستەی دەهێنێتەوە بەسەرو دەمو چاوی منداڵەکەیدا بۆ پیرۆزی، ووە بۆ ئەوەی منداڵەکەی صالح دەرچێت، یاخود لەش ساغ بێت.

-یاخود خەڵکانێکی نەزانی وا هەیە، ئەگەر نیازێکی لەدڵدا بێت، یان حەزبکات کە منداڵی ببێت، یان بۆ ئەوەی دڵنیا بێت کە لە قوتابخانە دەردەچێت، دەچێت بۆ سەر قەبری شێخێك،و ئەمجا بەردێکی سەر قەبرەکەی هەڵ دەگرێت و تۆزێك تفی لێوە دەدات، یان هەر بە ووشکی ئەو بەردە بچکۆڵە بەشێوەی بازنەیی هەڵدەسوێنیت لە کێلی قەبری ئەو شێخە، تا ماوەیەك بەردەوام دەبێت ئەمجا دەست بەردەدات لەو بەردە، ئەگەر ئەو بەردە نووسا و لکابە کێلی قەبرەکەوە ئەوا ئیتر ئەو کەسە تەواو دڵی خۆش دەبێت و دەڵێت: ئۆخەی شوکور نیازەکەم قبوڵ دەبێت، بەڵام ئەگەر بەردەکە کەوتە خوارەوە ئیتر دنیای بەسەردا ئەڕوخێت، بـۆ؟ چونکە نیازەکەی دڵی ئیتر قبوڵ نابێت، یان شوو ناکات ،یان جارێ منداڵی نابێت ،یان لە تاقی کردنەوەکانی سەری ساڵدا دەرناچێت.

- یاخود لەم ساڵەی کە ئێستا تیایداین، چاودێر بووم بەسەر قوتابی سێی ناوەندییەوە، قوتابیەکمان لابوو هەموو ڕۆژێك کە دەچووم سەیری ناو هەندەسەکەیم دەکرد، سەیرم دەکرد بەردێکی بچکۆڵەی تیادایە، هەتا دوو سێ تاقیکردنەوە ڕۆیی، ڕۆژێکیان کە سەیرم کردەوە هەر بەردەکەی هێنابوو لە گەڵ خۆیدا، پێم ووت: کوڕەکەگیان !!ئەوا ئەو بەردە چییە لەناو ئەم قەڵەمو لاستیك و قەڵەم دادەنەتدایە، کوڕەکەش ڕووی نەهات جوابم بداتەوە، ئیتر خۆم ووتم: ناشێت ئەم بەردە بەردی شەخصێك بێت، ئەویش ووتی: بەڵێ مامۆستا!!، ووتم: باشە ڕۆڵە ئەم بەردە بچووکە سوودی چییە بۆ تۆ، ناشێ باوەڕت وابێت ئەم بەردە بۆ پیرۆزی هێنابێتت لەگەڵ خۆتدا،ووە باوەڕت وابێت یارمەتیت دەدا لەوەڵام دانەوەی تاقیکردنەوەکانت، ووتی: بەڵێ مامۆستا بەدەنگێکی کزەڵەوەو وە تۆزێکیش بەسەر سوڕمانەوە سەیری کردم، کە من وای پێ دەڵێم و گاڵتەم بەو بەردە دێت ، بەڵام من بەردەکەیم هەڵگرت و فڕێم داو بەردەکە شکا، بەڵام ئەو قوتابییە زۆر زۆری پێ ناخۆش بوو، پاشان کە

**٨- باوەڕبوونی هەندێ لە خەڵکی نەزان بەوەی کە هەرکەسێ بکوژرێ لە شوێنێکدا، ئەوا قەرینی[1] ئەو کەسە لەخودی ئەو شوێنەی کە ئەم کەسەی لێ کوژراوە، بەشەواندا دێتە دەرو خەڵکی دەترسێنێ:**

وە ئەمەش بیروباوڕێکی پڕو پوچە،و هیچ بنچینەو بناغەو ئەصڵێکی نییە، نە لەقورئاندا، وە لەسوننەتدا، بەڵکو تەنها کۆمەڵێ فریودانە شەیتان خستویەتیە عەقڵی هەندێ لە خەڵکییەوە.

---

لەتاقیکردنەوەی دوایدا کە هاتەوە هیچی پێ نەبوو، بەڵام زۆر بە ڕقەوە سەیری دەکرم، بەڵام لە تاقیکردنەوەی دوای ئەو چوو بوو بەردێکی تری هێنابوو،منیش ووتم: چییە کوڕە بەردێکی ترت هێناوەتەوە، ئەمەیشت بۆیە هێناوە تا یارمەتیت بدا لە وەڵام دانەوەی تاقیکردنەوەی ئەمڕۆدا، ئیتر مەجبور بەجێم هێشت چونکە کەسێ خۆی ئەقڵی وابێت چی لەگەڵدا دەوترێت.

– یاخود هەندێك کەس کە بەردێکی دۆزیەوە لەسەر قەبری شەخصێك، وە ئەو بەردە کونێکی تیا بێت، دەچێت ئەو بەردە بە ملی دا هەڵ دەواسێت بۆ پیرۆزی.

– یاخود دەڵێن: لە هەندێك لەلادێکانی کوردستان، بەردی بچوکی سەرقەبری شەخصیان بردۆتەوە بۆ ماڵەوە،ووە خستویانەتە ناو قابلەمەی شیرەوە بۆ ئەوەی ئەو شیرە بگرسێت و ببێت بە ماست.

– یاخود لە هەندێك لادێی کوردستان ئەمە باوەڕیان بووە: خەڵکەکەی چوون بەردێکی خڕی گەورەیان لەشەخصێکدا دۆزیوەتەوە،ووە کاتێك کە باران نەباریوە بەردەکەیان بەدوو کەس هەڵ گرتووە،و وەکو پیرۆزی خستوویانەتە ناو حەوزی ئاوەوە بۆ ئەوەی باران ببارێت، وە ووتویانە: چونکە ئەم بەردە مێزەری صەحابەیە!!، بەخوا شتێکی سەیرە لای هەندێ لە خەڵکی کوردستان مێزەری صەحابە لە بەردە.

[1] قەرین:بەو هاوڕێیە دەوترێت کە لەگەڵ کەسێکدا بە یەکەوە بەندن و بەستراون بە یەکەوە، وە بەو شەیتانەش دەوترێت کە لەگەڵ هەموو مرۆڤێکدا هەیە، فەرمان دەکا بەو مرۆڤە کە خراپە بکات، وە شوێنێکی تایبەتی هەیە لەناو دڵی مرۆڤدا.

## ٩- باوەڕبوونی هەندێ لە خەڵکی کە لەڕۆژی هەینیدا، کاتێکی تیادا هەیە کاتی بەدبەختی و نەگبەتی یە:

وە ئەمەش بیروباوەڕێکی ناڕاستو ناڕەوایە، بەڵکو ڕۆژی هەینی یەکێکە لە باشترینی هەموو ڕۆژەکان لەلای خودا، وە لەڕۆژی هەینیدا کاتێکی تیادا هەیە کە دوعاو نزای تیادا قبوڵ و گیرا دەبێت .

ئێمامی "بەیهەقی" بەسەنەدێکی صەحیح فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە: کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : " اَفْضَلُ الأَيَامِ عِنْدَ اللهِ يوم الجُمُعَةِ "[1].

واتە: باشترینی ڕۆژەکان لەلای خوا رشۆژی هەینی یە.

وە ئیمامی "ابو داوُد" بە سەنەدێکی صەحیح فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە: کەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : " يَومُ الجُمُعةِ: لِثِنَا عشرةَ ساعةً، منها ساعةٌ لايُوجَدُ عبدٌ مسلمٌ يسألُ اللهَ فيها شيئاً الا آتاهُ اللهُ إيّاهُ "[2].

واتە: ڕۆژی هەینی دوانزە کاتژمێرە، لە یەکێك لەو کاتژمێرانەدا[3]، هەر بەندەیەکی موسوڵمان داوای هەر شتێ بکات لەخوای گەورە ئیللا خوای گەورە ئەو شتەی پێ دەبەخشێت [4].

---

[1] لە "صحيح الجامع"دا بە ژمارە (١٠٩٨).

[2] لە "صحيح الجامع"دا بە ژمارە (٨١٩٠)

[3] ئەو سەعاتەی کە لەڕۆژی هەیینی دا دوعای تیادا قبوڵە، لەدوای نوێژی عەسرەوە دەست پێدەکات تا نزیك بانگی مەغریب. کاتێکی تێدایە کە دیاری نەکراوە کە ئەو کاتەکە کەیە، هەر کەسێ دوعاکەی بەر ئەو کاتە بکەوێ قبوڵ دەبێت لە لای خودا.

[4] باوەڕبوونی هەڵە لەڕۆژی هەینی دا:
- ئەگەر جل لە ڕۆژی هەینیدا ببڕی، ئەوا ئەو جلە بەسووتان دەڕوات، یاخود دەسوتێت لە بەرتا.

## ١٠- باوەڕبوون لەگۆشتو ماسی دا : الأعتقادُ في اللحم والسَّمك

هەندێك لە ئافرەتان باوەڕیان وایە كە ئافرەتی زەیسان، ئەگەر یەكێك بێت بۆلای ماسییەكی پێبێت، یاخود گۆشتێكی كاڵی پێبێت، یاخود پیاوێك بێت بۆ لای سەری تاشی بێت، ئەوا شیری ئەو ئافرەتە لە مەمكیدا ڕادەگیرێو دەوەستێتو نایەتە دەرەوە بۆ منداڵەكەی، وەپێی دەڵێن :"مكبوسة"، واتە: ئەو شیرە كەپس كراوەو پەستێنراوە، وە لەبەر ئەوەیشە قەدەغەی ئەم جۆرە كەسانە لەم ئافرەتە زەیسانە دەكرێت كە بچن بۆ لای ، هەتا ٤٠ ڕۆژ تێ دەپەڕێت بەسەر زەیسانییەكەیدا، (واتا هەتا چلەی دەچێت).

وە بێگومان ئەمەش بیروباوەڕێكی بۆ گەنە[1].

---

- لەڕۆژی هەینی دا نان مەكە، یاخود ئیشی قورس مەكە، چونكە هەینی ڕۆژێكی قورسەو ئیشت بەدەستەوە نایەت.

[1] باوەڕبوونی هەڵە لە گۆشتو ماسیو زۆر بوونی شیرو منداڵ بووندا:

- دەڵێن: ئەگەر لووتت بخورێت، ئەوا گۆشت دەخۆیت لەدوایدا.

باوەڕ بوون لەماسیدا:

- هەندێك لە خەڵكی ئەگەر هەر ئێوارەیەك ماسی سوورەكراویان هەبوو، ئەوا ئەو تاوەیەی كە ماسییەكەیان تیادا سوور كردۆتەوە نابێت ئەو شەوەبێ شۆرن، چونكە دەڵێن: ئەگەر تاوەكەی بشۆین ئەوا مردوویەكمان لێ دەمرێت، یان هەواڵی مردوو مردنێكمان بۆ دەهێنن، بەڵكو دەبێت تا دووسێ ڕۆژ فڕێ بدرێ لە حەوشەی ماڵەكەیاندا .

- هەندێك لە خەڵكی ئەگەر تووشی نەخۆشی زەردوی بوو، لای خەڵكانی ئێمە دەچن ماسی بەزیندووی بۆ دەهێنن بۆ ماڵەوە، یان نەخۆشەكە دەبەن بۆ سەر حەوزی دەست نوێژ گرتنی مزگەوتێك كە ماسی تیادا بێت، پاشان ماوەیەك

نەخۆشەکە بە تەنها بەجێ دەهێڵن، وە پێی دەڵێن: سەیری ئەو ماسیانە زۆر بکە، بۆ؟ لەبەر ئەوەی خەڵکی باوەڕیان وایە ئەگەر ئەو نەخۆشەی کە تووشی زەردوی بوو، دەبێت سەیری ماسی زیندوو بکات ،وە باوەڕیان وا یە کە ئەو ماسییە بە سەیرکردنەکەی ئەو نەخۆشە ڕەق دەبێت و دەمرێت ،وە باوەڕیان وایە کە ئەو تیشکی زەردووییە لە چاوی ئەو کەسەوە دەردەچێت و،وە دایدات لەو ماسیە، ووە ئەوەندە بەهێزە ئەو ماسییەی ڕەق دەکات، وە بۆیە ئەم کارە دەکەن بۆ ئەوەی لە ڕێگەی مردنی ئەم ماسییەوە ئەو کەسە زەردووییەکەی چاك ببێت، وە دەڵێن: زەردووییەکە دەپەڕێت بۆ ئەو ماسییە.

- یاخود ئەو کەسەی کە زەردووی بێت، دێن مووروویەکی زەردی لەدەست دەکەن، پێی دەوترێت: مووروی زەردووی، ئەمجا دەبێت بە باوەڕی ئەو خەڵکە ئەو نەخۆشە هەمیشە سەیری ئەو مووروە بکات، بۆ ئەوەی زەردوویەکەی بپەڕێت بۆ ئەو موورەوە، باشە خەڵکینە مووروویەك خۆی ڕەنگی زەرد بێت، ڕەنگ زەردی خۆی بۆ لانابرێت، ئیتر چۆن دەتوانێ ڕەنگی زەردی چاوی مرۆڤ لاببات.

- یاخود لە هەندێك شوێنی کوردستان ماسی زەردیان بە باش زانیوە بۆ شیفادان وچاك بوونەوەی زەردووی.

بیروباوەڕی هەڵە دەربارەی منداڵ:

- منداڵ ئەگەر بە بچوکی نینۆکی بۆ بکەی، دز دەردەچێت .

- منداڵ بەری پێی خۆی ماچ بکات، ووڕکاوی دەردەچێت.

- ئەگەر منداڵێك ڕووی گرژ بێت، ئەوا کچی بەدوادا دێت .

- ئەگەر منداڵ بەساوایی مرد دایکی نابێت بچێتە سەر قەبرەکەی، چونکە لەو دنیا ئەو منداڵە دەم ووشك دەبێت.

- منداڵی لیکن لەش ساغ دەردەچێت.

- ئەگەر منداڵ لیکن بوو، ئەگەر خاڵۆی بە مقەست لیکەکەی بۆ ببڕێت، ئەوا ئیتر لیکنییەکەی نامێنێ.

- هەر منداڵێك پەنجە گەورەی قاچی بمژێت، ئەوا ئەو منداڵە کوڕی بەدوادا دێت.

- هەر منداڵێکی کچ پاژنە قاچی خڕبێت، ئەوا کوڕی بەدوادا دێت، بەڵام ئەگەر پاژنە قاچی درێژ بێت، ئەوا کچی بەدوادا دێت.
- ئەگەر منداڵ لەخەودا دەمی جووڵاند، ئەوا فریشتە شیری دەداتێ.
- ئەگەر منداڵ قەڵەو جوان بوو، ئەوا فریشتە شیری داوەتێ، بەڵام ئەگەر منداڵ زەعیف و ڕەنگ زەردبوو، ئەوا جنۆکە شیری مەمکی خۆی داوەتێ.
- هەندێك لە خەڵکی سەیری سەری کوڕە بچکۆلەکەی دەکات، ئەگەر هاتوو دوو ناو تەوقسەری هەبوو، پێی دەڵێت: ئەوا تۆ کە گەورە بووی دوو ژن دەهێنێ.

**بەڵام شێوازی هەڵە بۆ منداڵ بوون:**

- ئەگەر ئافرەتێك بە منداڵەوە بووبێت،و وە منداڵەکەی لێ نەبووبێتەوە،و زۆر ناڕەحەت بووایە، لەم کاتەدا دەچوون بۆ لای شێخێك، یاخود دەچوون بۆ لای کەسێك کە بە ئەخلاق بووبێت، پیان ووتوە بەو کەسە شەرواڵ پاك، ئا لەم کاتەدا کەس و کاری ئەو ئافرەتە زەیستانە بە نەخوێنی شەرواڵەکەی ئەو پیاوەیان هێناوەو وە لەناو قەدی ژنەکەیانەوە بەستووە، وە وتوویانە: چونکە ئەم پیاوە بەنەخوێنی حەرامی نەکردۆتەوەو وە بە ئەخلاقە بووە، بەڵکو بەهۆی ئەوەوە ئەم ئافرەتە منداڵەکەی لێ ببێتەوەو وە منداڵەکەی ببێت.

**بەڵام بیروباوەڕی هەڵە بۆ زۆربوونی شیری ئافرەت، ئەوەیە:**

- ئافرەتی وا هەیە کە شیرەکەی کەم دەکات، دەچێت مووروویەکی سپی درێژ هەیە کەپێی دەوترێت: مووروە شیرە، دەیکاتە ملی بۆ ئەوەی شیرەکەی زۆر ببێت.
- یاخود هەندێك لە ئافرەتان بۆ زۆر بوونی شیری، دێت گەنم دەبرژێنێت، وە لەگەڵ برژاندنەکەدا بە بەردەوامی "بسم الله "یشی لەسەر دەکات، وە هەروەها دەبێت دەست نوێژیشی هەبێت، دوایی ئەو گەنمە برژاوە لە شوێنێکی پاکدا دادەنێت، وە ڕۆژی چەند جارێك ئەو ئافرەتە دەچێتەوە سەر ئەو قاپەی کە گەنمە تیادایە،ووە چەند دەنکێکی لێ دەخوات و دەڵێت: خوایە ئەورزقەم پێ ببەخشیتەوە.
- یاخود هەندێك لەئافرەتان ئەگەر ویستییان منداڵەکەیان لە شیر ببڕنەوەو شیرەکەیان ووشك بکات، دێت ئەو ئافرەتە سێ ئەڵقەی پیاز دەکاتە ملی خۆی، بۆ ئەوەی شیرەکەی ووشك بکات.

## ١١- باوەڕبوون لە ئاسندا: الاعتقادُ في الحديد

هەندێك لە خەڵكی جۆرە بیرو باوەڕێكی بۆ دروست بووە لە ئاسندا، بەوەی ئەگەر هاتوو شیری ئافرەتێ لە منداڵەكەی بڕا، یاخود كەمی كرد، ئەوا بەو ئافرەتە دەڵێن: "مكبوسة"، واتە: شیری ئەو ئافرەتە كەپس بووەو پەستێنراوە .

ئەی باشە چۆن ئەم پەستێراو بوونە هەڵبەستراو ودرۆیە هەڵدەوەشێننەوە؟ دەچن كۆمەڵێ گوێزانی سەرتاشین دەهێنن كە بەكارهاتبێ و سەرو ڕیشی خەڵكی پێ تاشرابێت، بەئاو ئەو گوێزانانە دەشۆن، دوایی(ئەو ئافرەتەی كە شیرەكەی پەستاوەو وەستاوە)

---

هەندێك لەبیروباوەڕی پڕو پووچ لەكاتێكدا كە ژنێك زەیستان دەبێت:

- هەندێك لە ئافرەتان كە منداڵیان بوو، موورویەكی ڕەش كەپێی دەوترێت: (مورری شەوە) بەخۆیانەوە هەڵ دەواسێت تا ٤٠ ڕۆژ لە زەیستانییەكەی، لەترسی جنۆكە ئەم كارە دەكات، هەتا جنۆكە لێی نزیك نەبێتەوە.

- یاخود هەندێك لە ئافرەتانی زەیستان هەتا ٤٠ ڕۆژ ئێشكو حەراسەتی دەگرن، واتە: هەتا ٤٠ ڕۆژ دەبێت تا بەیانی بەلایەوە دابنیشن،و وەدەبێت هەتا بەیانی ئەو كەسەی كە لەلای دەبێت نەخەوێت، چونكە دەڵێن: ئەم ئافرەتە ئێشكی لەسەرە واتە: دەبێت حەراسەتی بگیرێ، لەترسی ئەوەی ئەوەكو جنۆكە دەستی لێ بوەشێنێت، یاخود شەوە منداڵەكەی بگوشێتو بیمرێنێت، وە هەروەها دەبێت بەشەو بەڕۆژ بەجێی نەهێڵن بەلای خۆیو منداڵەكەیەوە بن ،ئەگەر ئەو ئافرەتە چووە دەرەوە دەبیت لەگەڵیدا بچینە دەرەوە هاتە ژوورەوە لەگەڵیدا بێنە ژوورەوە، وەلای ئەو خەڵكە نەزانە دەبێت ئەو ئافرەتە زەیستانە ئاوی كۆن نەخواتەوە، دەبێت هەموو جارێك ئاوی تازەی بۆ بهێنن، وە نابێت دەماوی ئاوی كەس بخواتەوە، دەبێت لەئاوێك نەخوات كەسەری بەتاڵ بێت، و وە دەبێت لەئاوێك نەخوات كە هەنگاوی بەسەردانرابێت تا ٤٠ ڕۆژو شەو، بۆ؟ لە بەر ئەوەی نەك جنۆكە چەمۆڵەی لێ بدات

دەشۆرن بە ئاوی ئەو گوێزانە شۆراوانە، هەتاوەکو بەم کارە پەستاو بوونی ئەو شیرە نەمێنێ، وە شیرەکەی پێ زۆر ببیّو وە پێشی بێتەوە.
ئایا لەکەیەوە گوێزانو مەکینەی سەرتاشین ووە جگە لەمانە، شیری دایکی زۆر کردووەو چارەسەری نەخۆشی داوە؟!
ئەی خەڵکینە کوا عەقڵو هۆشتان ؟!!
پێی دەچێ هەندێ جار شەیتان دەستی هەبێت لەبڕانی ئەو شیرەدا، وەدوایی واز لەو شیرە دەهێنێ هەتا وەکو خۆی لێ بێتەوە، هەتاوەکو خەڵکی ئەو باوەڕەیان لە گوێزانو ئەو شتانەدا بۆ دروست ببێ، ئەمجا بڕوانە ئەم هەڵوێستەی شەیتان بەرامبەر بە خەڵکی کە چۆن لە هەوڵدایە بۆ هەڵ خەڵەتاندنیان.
ئیمامی" ئەحمەد" فەرمودەیەکی گێڕاوەتەوە (٣٨١/١) بە ژمارە (٣٦١٥) و "ئەحمەد شاکر"یش فەرموودەکەی بە "حسن" داناوە:
لە "زینب"ەوە خێزانی "عبدالله کوڕی مەسعود" – ڕەزای خوای لێ بێت- زەینەب دەفەرموێ: عبدالله عادەتی وابوو ئەگەر بۆ پێویستییەك بگەڕایەتەوە بۆماڵەوە، کاتێ کە دەگەیشتەوە بەر دەرگای ماڵەوە کۆکە کۆکی دەکردو تفی ڕۆدەکرد، چونکە پێی ناخۆش بوو بێتەوە بەسەرماندا وە ئێمە لەسەر شێوازێ بین ئەو پێی ناخۆش بێت.
دەفەرمووێ: ڕۆژێکیان کە هاتەوە بۆ ماڵەوە، دەستی کردەوە بە کۆکە کۆك وەکو جاران، وەمنیش پیرێژنێکم لابوو نووشتەی بۆ دەکردم بۆ نەخۆشییەکی پێست سووربوونەوە کە تووشم بوو بوو، منیش پیرێژنەکەم هەر چۆنێك بوو خێرا شاردەوەو کردم بە ژێر کۆمەڵی جلو جێگەدا.
دەفەرمووێ: عبدالله هاتە ژوورەوەو دانیشت لە پاڵمدا، وە دەزوویەکی بینی لەملمدا.
فەرمووی : ئەو دەزووە چییە لە ملتا ؟!!.

ووتم: دەزووییەکە نووشتەیەکیان بۆ کردووم تیایدا !!.

دەفەرمووێ: دەزووەکەی گرتوو پچڕاندی لە ملمدا، و پاشان ووتی: بەڕاستی کەس و کارو ماڵ و خێزانی عبدالله بێ نیازو بێ پێویستن لە شیرك، لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە کە فەرموویەتی: " اِنَّ الرُّقَى والتّمائِمَ والتِّوَلَةَ[1] شِركٌ "، واتە: بەڕاستی نووشتەو چاوەزارو نووشتەی چەورو شیرنی و ڕق لێ بوونەوە شیرك و هاوبەش بۆ خوا دانانە.

دەڵێ ووتم بە عبدُالله: بۆ وا دەڵێی!! خۆ جاری وا هەبووە کە چاوم دەفڕی، دەچووم بۆ لای فلاّن کەسی یەهودی تا نووشتەیەکم بۆ بکات بۆی، هەرکاتێ کە نووشتەکەی بۆ دەکردم ئیتر چاوم لە جووڵە جووڵ دەکەوت.

ئەمجا عبدُالله فەرمووی: ئا ئەو چاو فڕینە تەنها لە شەیتانەوە بووە، بەدەستی جووڵە جووڵی بەچاوت کردووە، و وە هەرکاتێ نووشتەکەی بۆ کردووە دەستی لێ هەڵگرتووە، وە تەنها بەس بوو بۆ تۆ لەو کاتەدا[2]، ئەو ذیکرە بڵێیت هەر وەکو چۆن پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (إذهَبِ البأسَ رَبَّ الناسِ، إشفِ انتَ الشّافي، لاشفاءَ اِلاّ شفائُك، شفاءً لايغادرُ سَقَماً).

واتە: ئەی پەروەردگاری خەڵکی ئێش و ئازارەکان ببەو لایان بە، چارەسەری نەخۆشییەکانمان بکە تەنها تۆی شیفادەری، هیچ

---

[1] التولة: ئەو نووشتەیەیە کە دەکرێت بۆ خۆشەویست کردن یان ڕق لێ بوونەوە، لەنێوان ژن و مێردا، کەپێی دەوترێ: نووشتەی چەورو شیرینی.

نووشتە: بریتییە لەو شتەی کە بۆ مەبەستی پیرۆزی هەڵی بواسیت بەخۆتدا، ئیتر ئەو شتە لە پەڕۆیەکدا بێت، یاخود دارێك بێت، یاخود بەردێك بێت، ئەوا هەر بەنووشتە دادەنرێت.

[2] واتە: لەکاتی چاو فڕینەکەدا، یاخود لەکاتی هەر نەخۆشییەکدا، سوننەت وایە کە ئەو ذیکرە بخوێنی.

چارەسەرو شیفایەك نییە جگە لە چارەسەرو شیفای تۆنەبێ، چارەسەرێکی وای نەخۆشییەکانمان بدەی هیچ نەخۆشییەك بەجێ نەهێڵی لەدوای خۆی، هەموو نەخۆشییەکان ببات و لایان بەرێت .

وە خوای گەورەش فەرموویەتی: ﴿وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ (الانعام: ١٧)، واتە: ئەگەر خودا بیەوێت تووشی ناخۆشییەکت بکات، هیچ هێزو توانایەك نیە ئەو گرفت و ناخۆشییەت لێ دووربخاتەوە، تەنها خودا خۆی نەبێ، وە ئەگەریش بیەوێت خێرو خۆشییەکت بێنێتەرێ،ئەوا هیچ کەس ناتوانێ ڕێگای لێ بگرێت، وە ئەوەی خودا خۆی بیەوێت هەر ئەوە دەبێت، چونکە تەنها(الله) خودایەو، بەسەر هەموو شتێکدا بە تواناو دەستەڵات دارە.[1]

## ١٢- باوەڕبوون لە پلاستیکدا : الأعتقادُ في البلاستيك

پیاوی وا هەیە کە سەیارەیەکی تازە دەکڕێت، خێرا ترسی چاو پیسی و حەسوودی بردنی بەسەیارەکەی لێ دەنیشێت .

---

[1] باوەڕبوونی هەڵە لەچاو فڕیندا:

- لای خەڵکی ئێمە، ئەگەر کەسێك چاوی چەپی بفڕێت، دەڵێن: ئەوا تووشی نارەحەتی دەبێت، وە ئەگەر چاوی ڕاستی بفڕێت، دەڵێن: ئەوا تووشی خێرو بەرەکەت دەبێت.

بەڵام نووشتەی چەورو شیرینی لای خەڵکی ئێمە ئەوەیە:

- ئەگەر ئافرەتێك مێردەکەی خۆشی نەویست و وە ڕقی لێ بویەوە، دەچێت نووشتەی چەورو شیرینی لێ دەکات، کە نووشتەکەیان بۆ کرد ئەمجا پێی دەڵێن: برۆ ئەم نوشتە بکەرە ناو سەرینەکەی مێردەکەت، یا بیکە ناو شەکرو چاکەی ماڵەوەتان، یا بیکەنە ئاوێك و بەجێگەکەیدا هەڵی بپرژێنە، ئیتر دوای ئەوە مێردەکەت بۆت کەر دەبێت و وەخۆشی دەوێت.

ئــەی ئــەبێ چــی بـکـات بـاشـــە ؟
کاتێـك دەزانــی خێـرا پارچـەیەك پلاسـتیك دەهێنـی کـە لەسـەر شێوەی دەستی مرۆڤــ دروست کراوە، ناویان نـاوە "خمسة وخميسة"، واتـە: پێنج پەنجەیی. پاشان هـەڵی دەواسـێ بەسەیارەکەیدا، بـەگومانی خۆی ئەو پارچە پلاستیکە چاوپیسی لەسەیارەکەی دەگێڕێتەوەو حەسوودی لادەبا!! .

لاالـه الاّ الله... ئایا پلاستیكو نایلۆن سوودو[1] زەرەرو زیـان بـه خـەڵکی دەگەیـەنێ، یـاخود سـوودو زەرەرو زیـان لـە خـەڵکی دوور دەخاتـەوە؟! نـەخێر، بـەڵکو پێویـستە مرۆڤــ بـاوەڕی وابـێ کـە سـوودو زیـان تـەنها بەدەستی خودایە.[2]

---

[1] مەبەست بـە نـەبوونی سوودو زیـانی نـایلۆن، لێرەدا ئەوەیـە کـە نـایلۆن سوودی لابردنی چاوپیسی نییـە، وە زیـانی تـووش کردنـی چـاو پیسی نییـە، ئـەگینا نـایلۆن سوودی هەیە کە وەکو تەشتو کەلو پەلی ماڵ بەکاردەهێنرێت، بەلام بۆ حەسوودی هیچ سوودێکی نیە

[2] باوەڕبوونی هەڵە لە خۆپاراستن لە حەسوودی :
لای خەڵکی ئێمە بۆ خۆپاراستن لە حەسوودی کۆمەڵێك ڕێگای پڕو پووچ دەگرنە بەر وەکو:
- ئەگـەر ترسـان حەسـوودییان پـێ ببرێـت، ئـەوا دەچـن چـاوەزار هــەڵ دەواسـن بـەدەرگای دەرەوەی ماڵەکەیانـدا، کـە چـاوەزارەکان چـەند جـۆرێکن: یـان تاکـە پێڵاوێکی کـۆنی دڕاو بـە دەرگاکەیانـدا هـەڵی دەواسـن، یـان کونـاو کـونو دەشـتو دەرو چۆڵەوانی دەگەڕێن، بەڵکو کەرێك یان ئەسپێکی تۆپیوویان بەرچاو بکـەوێت، ئەگەر بەرچاویان کەوت خێرا ناڵەکەی لەپێی هەڵ دەکێشنو لێـی دەکەنـەوە لـە بنـی پێـی، دوای دەهێننـەوەو بەدەرگاکەیانـدا هـەڵی دەواسن، یان پارچـەیەك لـە پێـستی بەراز پەیدا دەکەنو هەڵی دەواسن بەدەرگای دەرەوەی ماڵەکەیاندا، چونکە دەڵێن: پێستی بەراز تیر نای برێت، وە چاوی پیسیش وەکو تیر وایە، بـەڵکو کـە چاومان پێوەکرا ئەم پێستە بەرازە بیگێڕێتەوە لێمان.

- یاخود دەڵێن: ئەگەر گومانت هەبوو لەئافرەتێکدا کەوا حەسوودی پێ بردبی، ئەوا شوێنی بکەوە بەدزییەوە کە ئاگای لە خۆی نەبوو، پارچەیەك لە ماکسییەکەی یان کراسەکەی لە دەری قنی( دوور لەڕووی ئێوە) ببڕە، ئیتر حەسوودییەکەی کارت لێ ناکات.

- یان ئەگەر ترسای منداڵەکەت حەسوودی پێ ببرێت، ئەوا چەند تاڵە قژێکی ناوچاوی بهێنە خوارەوەو، وە بە بنێشتە تاڵ کلاٚنکەیەکی شین، یان چاوەزارێك کە لە ئاڵتون دروست کراوە پیای هەڵ بواسە، با چاو کاری تێ نەکات، یاخود موورووییەکی شین بەناوچاویدا هەڵبواسە.

- یاخود هەندێك لە ماڵان دەچن گوی سەگ دەهێننو لە حەوشەی ماڵەکەیاندا دەی سوتێنن، بۆ ئەوەی چاوی پیس کاریان تێ نەکات، وە ئەو گوی سەگە نارەحەتییان لەسەر لاببات.

- یاخود هەندێك لە ماڵان سەرە ئاسکێك بەدووشاخەوە بە دەرگاکەیدا هەڵ دەواسێت بۆ نەهێشتنی حەسوودی، یان پارچەیەك گەچ دەهێنن کە ڕەنگی شین کراوەو، لەناوەڕاستی ئەو پارچە گەچەدا کە شێوەیەکی خڕی هەیە چاوێك دروست کراوەو وە پێنج پڵ پڵەی خڕیش بەچوار دەوریدا دروست کراوەو، کراوە بە چاوە زار و بەدەرگای ماڵەکەیدا هەڵی دەواسێت.

- یاخود هەندێك لە خەڵك کە کەلو پەلێکی تازەی ماڵیان کڕی، کە لەو کاتەدا کە دەیبەنە ژوورەوە، دڵیان لە هەر کەسێك پیس بێتو بترسن حەسوودییان پێ ببات، ئەوا دوو هێلکە بەرەو ڕووی ئەو کەسە یان بەرەو ڕووی ماڵەکەی دەشکێنن.

- یاخود هەندێك لە نانەواکان کە بەیانیان پێش ئەوەی دەست بکەن بەئیش، ئەگەر ترسی حەسوودییان هەبوو پێیان ببرێت، ئەوا ئەو نانەوایە دەچێت ناوی ئەو کەسانە لەسەر پارچەیەك کاغەز دەنووسێت،و ئەمجا یەك یەك تف لەناوەکان دەکاتو،وە کاغەزەکە فڕێ دەداتە ناو تەنورەکەیەوەو،وە ئەو ناوانە دەسووتێنێت کە دەترسێ حەسوودی پێ ببەن .

- یاخود ئەگەر لە هەر کەسێك ترسان حەسوودییان پێ ببات، هەرکاتێك چاویان بەو کەسە کەوت دەڵێن: " یاحافِظَ الله محفوظ " لامان دەی لە نفوس.

## ١٢- بـــاوەڕبـوون لـــە پـێـڵاودا: الأعـتـقـاذُ في الـحـذاء

لەناو خەڵکیدا کەسانێکی وا هەیە عەقڵی خۆی پووچەڵ کردۆتەوەو، وە بیرکردنەوەی خۆی هەڵوەشاندۆتەوە، وە لاسایی و چاولێکەری کەسانی تر دەکاتەوە، باوەڕی کردووە بەوەی کە پێڵاو - خودا ڕێزدارتان بکات - سـوودو زەرەرو زیـان دەگەیـەنێت، هـەر کاتـێ کـە کارگەیـەکی تـازەی دروست کرد، یاخود سەیارەیەکی تازەی کڕی، ئیتر چاو پیسی لەسەر شتەکانی بۆ دروست دەبێ،خێرا هۆمەن دەبا بۆ "تاکە پێڵاوێك" و هەڵی دەواسێت بەسەیارەکەیدا، بەگومانی خۆی ئەو تاکە پێڵاوە حەسوودی لەسەیارەکەی دەگێڕێتەوەو چاو پیسی بۆ لادەبا[1].

وە بـێ گومـان ئـەم کـارەش گومڕاییـەکی ئاشکرایە، وەنابێـت بـەهیچ شێوەیەك ئەوە هەبێ لەوولاتی موسوڵمانانندا.

بـەڵێ، پێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرمووێ : " العـينُ حَـقٌ "[2] واتـە: چاوپیـسی ڕاستەو هەیە، بەڵام چارەسـەرکردنەکەی ئەوەیە ئەگەر هاتوو مرۆڤـ لـە شتێکی چـاو پیسی ترسـا، پـەنا دەگرێـت بـەخوا بـەو ووتانـەی کـە لـە

---

- یاخود هەندێك لە خەڵکی ئەگەر کوڕیان ببێت، ئەوا تا نزیکەی دووساڵ نایـەڵن خـەڵکی زۆر بیبنێـت، نـەك حەسوودی پـێ ببـەن، وە ئەگـەریش ئـەو کوڕەیـان بـردە دەرەوە لەگـەڵ خۆیانـدا دەیخەنـە باوەشـی خۆیـان و، وە پەڕۆیـەکی گـەورەی دەدەن بەسەردا بۆ ئەوەی کەس چاوی پێی نەکەوێت.

[1] ئاخر خەڵکینە پێڵاو خەڵکی لەپێی دەکا، بەقوڕو چڵپاو داڕو بەردیا دەبـــات، کەچی ئەو پێڵاوە توانای ئەوەی نییە کەخۆی لە قاچی ئەو کەسە ڕزگار بکات، کە ئیتر لەپێ نەکرێ، وە بە هەموو پیسیەکدا نەبرێت، سوودی بـۆ خۆی نـی یە ئیتر چۆن سوودی بۆ خەڵکی دەبێت و حەسوودییان بۆ لادەبات .

[2] حديثٌ صحيح: رواه البخـاری (١٠/٢١٣) ، ومسلم ق "السلام" لـەبابی "الطـب"دا (١٣/١٧٠-نووی)

پێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتووە کە فەرموویەتی: " أُعِيْذُ بكلماتِ اللهِ التّامةِ، مِن كلّ شيطانٍ وهامّةٍ، ومن كلّ عينٍ لامّةٍ "، واتە: پەنا دەگرم بە ووشە تەواوەکانی خودا، لە هەموو شەیتانێك و گیانلەبەرو، زیندەوەرێکی زیان بەخشی خاوەن ژەهر، وە لە هەموو چاوێکی لۆمە کراو و پیس.

وە چەسپاو جێگیر بووە کە پێغەمبەر (ﷺ) "حەسەن و حوسەین"ی بەم ذیکرە پەنادەداو دەی فەرموو پێیان: " أُعيذُ بكلماتِ اللهِ التّامةِ، مِن كلّ شيطانٍ وهامةٍ، ومن كل عينٍ لامّةٍ "، واتە: پەنا دەگرم بە ووشە تەواوەکانی خودا، لە هەموو شەیتانێك و گیانلەبەرو، زیندەوەرێکی زیان بەخشی خاوەن ژەهر، وە لە هەموو چاوێکی لۆمە کراوو پیس، وە دەیشی فەرموو: " كان أبو كُما ابراهيم يَعَوِّذُ بهما اسماعيلَ واسحاقَ "[1]، واتە: باوکی ئێوە کە ئیبراهیم بوو، پەنای (ئیسماعیل و ئیسحاق)ی هەردوو کوڕی بەم ذیکرو پاڕانەوەیە دەدا[2].

---

[1] حديثٌ صحيح: رواه البخاري (٦/٤٥٨-فتح).

[2] باوەڕبوونی هەڵە لە پێڵاودا:

- لای خەڵکی ئێمە، ئەگەر ترسی ئەوەی بوو کەخەڵکی حەسوودی پێ ببەن، دەچێت پارچەی پێڵاوە کۆنێك دەهێنێت و،وە بە بەشی سەرەوەی دەرگاکەی دەرەوەیدا هەڵی دەواسێت، ئەگەر پرسیاری لێ بکرێت و بڵێن: بۆ ئەم پارچە پێڵاوەت هەڵواسیوە؟ دەڵێت: یەعنی هەر کەس چاوم پیا هەڵدەهێنێت، یەعنی چاوی چڵکنی بەم تاکە پێڵاوە.

- یاخود هەندێك کەس باوەڕی وایە ئەگەر پێڵاو بە هەڵگەڕاوەی ڕووی لەئاسمان بێت، واتە: ئەوا چەموڵە لەخوا دەنێت!! بۆیە یەکسەر دەچێت ئەو پێڵاوە دەخاتەوە سەردەم، ئەگینا ئەگەر وای لێ نەکاتەوە ئەوا خۆی بەگوناهبار دەزانێ، بۆ؟ دەڵێت:

## ١٤- باوەڕبوون بەوەی کە ناوی پێغەمبەر پاسەوانی منداڵان دەکاو دەیان پارێزێت:

هەندێ لە ئافرەتان کەبینی کەسێك سەیری منداڵەکەی دەکا، دەترسێ ئەو کەسە حەسوودی بە منداڵەکەی ببات، لەو کاتەدا دەڵێت: " اسمُ النبيِّ حارسُهُ وصائِنُهُ "، واتە: ناوی پێغەمبەر پاسەوان و پارێزگاریەتی.

وە ئەمەش بیروباوەڕێکی بەتاڵ و ناڕاستە، لەبەر ئەوەی هەرچەندە پێغەمبەر (ﷺ) چاکترینی دروست کراوەکانی خودایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەدەستی نییە بۆ خودی خۆیشی نەسوودو وەنەزەرەر و زیانیش، وە خوای گەورەش بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەفەرمووێ:

﴿قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ﴾ (الاعـراف: ١٨٨)،

واتە: ئەی محمد (ﷺ) بەگرۆهی ئادەمیزاد بڵێ: من نە بۆ خودی خۆم وە نەبۆ جگە لەخۆمیش دەستەڵاتی ئەوەم نییە، نەخێرو خۆشی،و وە نەسوودو قازانج بۆ خۆم بهێنم، وە نەزەرەرو زیانیش لە خۆم دووربخەمەوە، مەگەر ئەوە نەبێ کە خوا ویستی لەسەریەتی تووشم بکات.

وە دەفەرموێت خوای گەورە ﴿قُلۡ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا رَشَدٗا﴾ (الجن:٢١)، واتە: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) تۆ بەوان بڵێ: من ناتوانم زیانتان لێ دوور بخەمەوە، یاخود سوودو قازانجتان بۆ کێش بکەم، چونکە سوودو قازانج و زەرەرو زیان بەدەستی خوایەو لە ژێر دەستەڵاتی ئەو دایە .

---

چونکە ئەو پێڵاوە ڕووی بەرەو ئاسمان و خوایە نابێت وابێت ئەگینا خوا غەزەبمان لێ دەگرێت.

کەوابوو ئەگەر ئەمە حاڵو وەزعو توانای پێغەمبەر (ﷺ) بێت، ئیتر چۆن پێغەمبەر (ﷺ)، یاخود ناوی پێغەمبەر (ﷺ) پاسەوانی منداڵان دەکا، یاخود دەیان پارێزێ لەو شتانەی کە ئازاریان دەدا[1].

## ١٥- باوەڕبوون لە تەختەدا: الأعتقادُ في الخشب

هەندێ لە خەڵکی باوەڕیان وایە کە تەختە بەربەستی حەسوودی دەکات، وە حەسوودی دەگێڕێتەوە، وە هەرکاتێ ترسا لە حەسوودی دەڵێ: "إمْسِكِ الخَشَبَ"، واتە: تەختەکە بگرە[2].

ئەمەش بیروباوەڕێکی بەتاڵو ناڕاستە، نابێت موسوڵمانی ژێر باوەڕی بەمانە هەبێت، بەڵکو ئەگەر ترسا چاو بکات بەشتێکەوە بڵێ: "ماشاءَ الله، اللّهُمَّ بارك"، واتە: ئەوەی خوا ویستی لەسەر بێت هەر ئەوە دەبێت، خودایە بەرەکەتی بەسەردا بڕێژە.

وە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَلَوۡلَآ إِذۡ دَخَلۡتَ جَنَّتَكَ قُلۡتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ﴾ (الكهف:٣٩)، واتە: ئەوە بۆچی کاتێک

---

[1] باوەڕبوونی هەڵە لەناوی پێغەمبەردا (ﷺ):

- لای خەڵکی ئێمەدا، ئەگەر دایکێك بۆ کوڕەکەی بپاڕێتەوە، دەڵێت :دەك پێغەمبەر ئاگایارت بێت.

- یان دەڵێت: دەك مەولودی پێغەمبەر لەدەوری سەرت گەڕێت.

[2] ئەمە قسەیەکە خەڵکی میسر دەیڵێن، لەکاتێکدا کە بترسن یەکێك حەسوودی پێ ببرێت، بەو کەسە دەڵێن: کوڕە دەست بگرە بەدارەکەوە، وە مەبەستیان پێی ئەوەیە کە دەست گرتن بەشتێکەوە مروڤ بە هێزی دەکات،و بەڵکو ئەو دارە حەسودییەکە بگرێتەوەوتوشی نەبیت.

چوویته ناو باخە ڕازاوەکەت[1]، وە چاوت بەو گشت بەروبوومە جوانە کەوت، وە لە دیمەنەکانیت ڕوانی، بۆچی سوپاسی خوات نەکرد، با ئەو کاتەی کە چوویتە ناو باخ و باخاتەکەتەوە بتگوتایە : "ماشاء الله لاقوة الا بالله"، واتە: هەرشتێ خودا ویستی لەسەر بێ هەر ئەوە دەبێت، ئەم نازو نیعمەتە بەخشینی خوایە، ئەمە ئەوەیە کە خوا ویستویەتی بی بەخشێت بە من، وە ئەوەی کە خودا بیەوێت بێگومان هەر ئەوە دێتەدی، وە هیچ هێزو توانایە نییە جگە لەهێزو توانای خودا نەبێ.

وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بەو هاوەڵەی کە چاوی کردبوو بەکەسێکی ترەوە (الاّ بَرَّکْتَ)[2]، واتە بۆچی داوای بەرەکەتت بۆ نەکرد لەخوای گەورەو بڵێی: "ماشاءَ اللهُ اللهّم بارِكْ عليهِ"، یاخود بلێی: "ماشاء الله لاقوة الاّ بالله"[3].

---

[1] ئەمە چیرۆکی دوو برا باس دەکا کە لە سوورەتی (کەهف) دا هاتووە، یەکێکیان باخێکی هەیە، بەڵام سوپاسی خوا لەسەر ئەو باخە ڕازاوەیەی ناکات، بەڵام براکەی تری ئامۆژگاری دەکا کە خوای لە بیر نەچێت لەسەر ئەو نیعمەتانەی پەروەردگار.

[2] حديثٌ صحيح: رواه احمد والنسائي وابن ماجه، وە شێخ ئەلبانی لە (صحیح الجامع)دا بە صەحیحی داناوە بە ژمارە (٣٩٠٨) .

[3] باوەڕبوونە لە دارو تەختەدا:

– لە یەکێك لە شەخصەکانی نزیك سنوری ئێران، خەڵکی دەچن پارچەیەك داری ووشك لەدارەکانی چواردەوری ئەو شەخصە دەهێنن، بە مەبەستی بەکارهێنانی ئەو پارچە دارە ووشکە بۆ نەهێشتنی ددان ئێشە، ئەمجا کە ئەو پارچەدارەیان هێنایەوە بۆ ماڵەوە، هەرکاتێك منداڵێکیان یان یەکێك لە ئەندامانی ئەو ماڵە ددانی ئازاری کرد یەکسەر ڕادەکات ئەو پارچە دارە دەهێنێت،و بە بەردەوامی ئەو دارە دەهێنێت بەڕوومەتیا لەڕێکی ئەو شوێنەی کە ددانەکەی لەژێردایەو ئازار دەکات، ئەمجا هەر منالەی داماو ددانەکەی ئازاری کرد خێرا خێرا دارەکە لە ڕوومەتی هەڵ دەسووێت، بەڵکو ددانەکەی ژێر ڕوومەتی ئازارەکەی نەمێنێ، بەڵام دارەکەی "کاکە شێخ" هیچ

## ١٦- ترسان لەمردوو: الخوفُ منَ الاموات

هەندێ لە خەڵکی باوەڕی وایە ئەگەر باسی فلانە کەسێ بکرێ لە پیاوچاکان بە خراپە، ئەوا ئەو پیاوچاکە ئازاری دەدا لە لاشەیدا، یان لە ماڵیدا، یان لەمناڵیدا.

وە ئەمە بیرو باوەڕێکی بەتاڵو ناڕاستە، لەبەر ئەوەی دەستەڵاتدار لەم بوونەوەرەدا تەنها خوای بەرزو بڵندە.

بەڵێ، نابێت بەهیچ شێوەیەك باسی مردووی موسوڵمانان بکەین ئیللا بە خەیرو چاکە نەبێت، هەروەك چۆن جێگیر بووەو هاتووە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: **" لاتذکروا امواتکم الاّ بِخَیرٍ "**[1]، واتە: باسی مردووەکانتان مەکەن ئیللا بەخەیر نەبێت.

وە دووبارە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: **" لاتسُبوا الاموات، فَاِنّهم قد اَفضَوا الی ما قَدِمُوا "**[2]، واتە: قسە مەڵێن‌و جنێو مەدەن بە مردووەکان، چونکە گەیشتون بەو شوێنەی کە بەکردەوەی خۆیان ئەنجامیان داوە.

وە ترسان یەکێکە لە عیبادەت‌و پەرستشەکانی دڵ "العبادات القلبیە" کە واجبە ڕوواو ڕوو نەکرێ‌و بەکار نەهێنرێ جگە لە بۆ تەنها خودا نەبێت[3]

---

سوودێك بەددان ئێشەکەی ناگەیەنێت، چونکە پارچە دارێك چی بۆ دەکرێت خۆ دەرمان نییە ئازارەکە نەهێڵێ، بەڵام مندالەی داماو هەر بەردەوام دەبێت هەتا چاوی سیس دەبێت‌و خەوی لێ دەکەوێت، کە دوای یەك دوو سەعاتێك کە خەبەری دەبێتەوە سەیر دەکات ئازارەکەی نەماوە، وا دەزانێ ئەم پارچە دارە ووشکە شیفای داوە، نازانێت کە کاتێك خەوی لێ کەوتووەو ئاگای لەخۆی نەماوە، ئازارەکە لەسەر خۆ کەم بۆتەوەو هەتا ژانی ددانەکەی نەماوە.

[1] حدیث حسن: رواه النسائي (٤/٥٢)، وە (حافظي عیراق)یش دەفەرمووێ: إسنادُهُ جیّدٌ.

[2] حدیث صحیح: رواه البخاري (٣/٥٥٢- فتح).

[3] ترسان لەمردوو:

- لای خەڵکی ئێمە ئەگەر قسەیەك بکەی بەرامبەر بە شەخصێك، یەکسەر پێت دەڵێن: قسەی بەرامبەر نەکەی ئەگین پێت ئەنوێنێ.
- یان دەڵێن: ئەو فلان شەخصە ئەت کات بە قوڕاو شێت‌و شبرت ئەکات.
- یان دەڵێن: قسە نەکەی بەرامبەری، چونکە دەمت لار دەکات، یان گۆج‌و ئیفلیجت ئەکات، یان دەڵێن، فەوتت دەکاو تەفرو توناو ماڵ‌و حاڵت نغرۆ ئەکات.
بەڵام لای خەڵکی ئێمە وەکو لەو جۆرە مردووانەش ئەترسن، کۆمەڵێك بیروباوەڕێ پووچیشیان هەیە لەسەر مردن ومردوو و وە چونە سەر قەبران، وەکو:
١- کاتێك کە مردووەکە دەشۆرن:
- دەبێت تا تەعزییەی ژنان لە ماڵەوە تەواو دەبێت، کە تا سێ ڕۆژە دەبێت تاتە شۆرەکەی کە مردووەکەی لەسەر شۆراوە لەبەردەم دەرگای ئەو ماڵەی کە تەعزییەی ژنانی تیایە لانەبرێت، بـۆ؟ نازانم: لەوە دەچێت بۆ ئەوەبێت، دەڵێن: دوای تەواو بوونی تەعزی یەکەی مردووەکە ڕۆحیانەتەکەی دێتەوە بۆ ماڵەی خۆی!! لەوە دەچێ بۆیە ئەو تاتە شۆرە نابەنەوە، تا مردووەکە کە هاتەوە ئەمجارەیان خۆی بچێت لەسەری خۆی بشوات.
- دەڵێن کە مردووت لێ مرد، دەبێت تا سێ ڕۆژ لەو شوێنەی کە مردووەکەی لێ شۆراوە چرایەك دابنرێت، بۆ؟ چونکە دوای سێ ڕۆژانەی تەعزییەکەی ڕوحەکەی دێتەوەو سەیری ماڵەکەی خۆی دەکات، با ماڵەکەی ڕووناك بێت( ئەی بۆ ناو قەبرەکەی چی دادەنێن!!) .
٢- دوای بەخاك سپاردنی مردوو:
- دەبێت نەریت وایە کە مردوو بەخاك سپێدرا، ئەوانەی کە چوون بۆ سپاردنی بێنەوە بۆ بەردەم ماڵی مردووەکەو گەردنی ئازاد بکەن‌و فاتحەی بۆ بنێرن.
- ئەمجا تەعزی یەی بۆ دادەنرێت ،دوو ڕۆژ بۆ پیاوان لە مزگەوت‌و سێ ڕۆژیش بۆ ژنان لە ماڵەوە، بۆ هەردوولاش دەبێت یەکی کەسێك بە پارە بگرن قورئانیان بۆ بخوێنێت، بەتایبەتی دەبێت بۆ ژنان ئافرەتێك بە پارە بگرن شیعرو هۆنراوەیان بۆ بڵێت‌و مردنیان بیربخاتەوە، چونکە دەڵێت: بەخوا شتێکی چاکە باغەیبەت نەکەین.

- ئەمجا سێ ڕۆژانە چوون بۆ سەرقەبران، یان سێ شەممان دوانیوەڕۆیان، یا هەموو جومعەیەك چوون بۆ سەر قەبران، وە دوایی کەسێکی بۆ دەگرن هەموو جومعەیەك و سێ شەممەیەك قورئان بەسەر قەبری مردووەکەیاندا بخوێنێت.
- پاشان چلە کردن بۆ مردوو، ساڵانە، نۆ جەژنە، یان خەتمی (لا الـه الا الله) ی بۆ دەکەن لەسەر قەبرەکەی، یان دوای سێ ڕۆژەی تەعزێ هەندێك لە خەڵك حەڵوا دەبەخشێتەوە، یان بۆ پیاوان لە ماڵی مردووەکە دوای تەواو بوونی تەعزیەکەی ساردی وپاقلاوەو مۆزو قۆخ و ئەمانە دادەنرێت بۆ خەڵکی، یان لای هەندێك خەڵك تا ٤٠ ڕۆژ دوای مردنی ئەو مردووە هەموو ژەمێ چەند خواردنی خواردووە دەیبەن بۆ ماڵی فەقیرێك، دەڵێن:بــــا ئەو کەسە فەقیرە لە جیاتی مردووەکەمان بی خوات.
- پاشان سەیری پڕو پووچی تر بکە:
- بنێشت بەشەو بجوی، ئەوا گۆشتی مردوو دەخۆی.
- گڵی سەرقەبران مەهێنە بۆ ماڵەکەت، چونکە فەقیر دەبیت.
- مەنجەڵی ڕەش بەشەودا مەبەرەوە بۆ ماڵی خاوەنەکەی، چونکە خراپە مردوویان لێ دەمرێت.
- ئەگەر کەسێك لە تەعزێیەکەوە هەستا خراپە بچێت بۆ ماڵان، چونکە خراپە ئەو ماڵە مردوویان لێ دەمرێت، ئەگەریش چوو دەبێت نەچێتە ژوورەوە هەر لەدەرەوە بووەستێ و قسە لەگەڵ ئەندامانی ئەو ماڵەدا بکات.
- نابێت ژنی زەیستان سەیری مردوو بکات، چونکە دوایی منداڵەکەی بەناڕەحەت لێ دەبێتەوە.
- کە چووی بۆ سەر قەبری مردوو، دەبێت لای خوارەوەی بوەستی، بامردووەکە چاوی لێت بێت.
- کە لە سێ ڕۆژانە چوویتە سەر قەبری مردوو، خێرا فاتیحە دامەدە، چونکە ئەو مردووە چاوی لێت نابێت، وە بەفاتیحەکەوا مەشغوڵ دەبێت.
- هەرکەسێ مردووی لێ مرد، گڵی سەر قەبرەکەی بکە بەسەر کەسوکاریی دا با مەیلییان بۆ ئەو مردووەیان نەمێنێ.
- قەبر تازە بکەیتەوە مردووت لێ دەمرێت.

## ١٧- باوەڕبوون لەوەدا کە چەرم (الجلد) ڕزق و ڕۆزی دەهێنێ:

هەندێ لە گەنجان بازنەیەك لە چەرم دەکەنە دەستیان، وە واگومان دەبەن کە ئەمە بەخت و شانسی باشیان بۆ دەهێنێ،وە ناویان لێ ناوە: "**حظاظة**"، واتە: بەختەوانە.

وە ئەمەش دووبارە بیرو باوەڕێکی گەندەڵە، کە پێویستە موسوڵمانان خۆیانی لێ پاك بکەنەوە، وە ئەم شتەش یەکێکە لە نوشتە، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی : " **مَنْ تَعَلَّقَ تَميمةً فلا أَتَمَ اللهُ لَهُ، ومن تَعَلَّقَ وِدَعَةً**[1] **فلا وَدَّعَ اللهُ له** "[2]، واتە: هەرکەسێ نوشتەیەك بەخۆیەوە هەڵ بواسێت، دەك خوای بۆی تەواو نەکات ئەو

---

- کەچوویتە سەر قەبری مردوو بە بەردێك بدە لە کێلی قەبرەکەی، با بزانێت کە هاتوویت و سەیرت بکات.

- یاخود ئەگەر سەیری قەبرت کرد بەچۆڵی، ئەوا دەبێت گۆشتی شتێك لەخۆت حەرام بکەی، هەندێك ژن یەکسەر دەڵێت لەو کاتەدا: ئەوا گۆشتی چۆلەکەم لەخۆم حەرام کرد، ئیتر دەبێت ئەو کەسە تا دەمرێت ئەو گۆشتە نەخوات.

- کە مردوو برا بۆ سەر قەبران ئاوی بەدوادا بکە، بۆ ئەوەی لەدوای خۆی ڕووناکی بەجێ بهێڵێت.

- یان دەڵێن: ئەگەر مردوو هاتە خەوت ئەوا داوای خێرت لێ دەکات، یاخود ئەگەر مردوو پارچەیەك جلی بردی، یان خۆت لەگەڵیدا ڕۆشتی ئەوا خۆت دەمری.

- یاخود دەڵێن:ئەگەر قەبر هەڵ کەندرا،نابێت شەوی بەسەردا بێت،چونکە خراپە!!.

[1] **ودعة** : بریتییە لەو سەدەفانەی کە لەناو دەریادا هەیە: وەپیان دەوترێت: "گوێچکە ماسی" وە ڕەنگیان سپی یە، وە لەناویاندا مرواری بەنرخی تیادایە، کە ئەم گوێچکە ماسیانە وەختی خۆی بە ملی منداڵیاندا هەڵیانواسیوە ، بۆ ئەوەی حەسوودی و چاویان پیا هەڵ نەهێنرێت.

[2] حديثٌ صحيح :رواه احمد (١٤٥/٤) والحاكم (٢١٦/٤) و صححه ووافقه الذهبي.

مەبەستەی کە ئەو کەسە دەیەوێت لەو نووشتە هەڵواسینەدا بۆی بێتە جێ، وە هەرکەسێ گوێچکە ماسییەك بەخۆیدا هەڵ بواسێت، دەك خوا ئەو کەسە نەپارێزێتو، وەسووكو ئاسانی نەکات لەسەری ئەو شتەی کە لێی دەترسێت.[1]

## ١٨- بەڕاست زانینی جادووگەرو فاڵچیەکان: تصديقُ الكَهَنَةِ والعرَافينَ

لەناو خەڵکیدا کەسانێکی وا هەیە دەچێت بۆ لای جادووگەرو فاڵچیەکان، هەتاوەکو سیحرێکی بۆ هەڵبوەشێننەوە، یاخود هەتاوەکو ئەو ساحیرانە خێری بۆ بهێنن بە بۆچوونی ئەو، وە ئەو داماوە نازانێ بە ڕۆیشتنی بۆ لای ئەو جادووگەرانە لەدەستی چووە لە تەرازووی چاکەکانیدا "٢٠٠" نوێژ کە کردوویەتی ،ئەویش بە بەڵگەی ئەو

---

[1] باوەڕبوونی پڕو پووچ لە زۆربوونو بەرەکەت بوونی ڕزقو ڕۆزی دا:
- خەوبینین بە پیسایی مرۆڤەوە ڕزقو ڕۆزییە.
- ئەگەر ئاگر بەر بوو لەماڵت، دەڵێن: نەشەمەی باشە، دەوڵەمەند دەبیو ڕزقو ڕۆزیت زۆر دەبێت.
- مێلووره پیات هەڵگەڕێت ڕزقت بۆ دێت.

بۆ کەم بوونەوەی بەرەکەتو ڕزقو ڕۆزیش ، وەکو:
- ئەگەر گونك بڕ زیادەی گونکی هەویر بخاتەوە ناو تەشتی هەویرەکەی، ئەوا ئەو هەویرە بێ بەرکەت دەبێت.
- لەسەر نان کردنو هەویر شێلان قاچ ڕاکێشی، ئەوا بەرەکەتی نامێنێ.
- زەخیرەی ماڵ ئەگەر لەسەرەوە دەری بهێنی کەم دەکات، دەبێ ئەو شتەی کە زەخیرەکەی تیایە کونێکی لە خوارەوە تێ بکەیتو وە لەوێوە دەری بهێنێ.
- یاخود بۆ زۆربوونی بەرەکەت، ئەگەر دراوسێیەکت خواردنی بۆ هێنای، ئەوا دوایی قاپەکان بەخاڵی مەنێرەوە، بەڵکو خواردنێکی بۆ تێبکەرەوە بۆ ئەوەی ئەو ماڵە بێ بەرەکەتیو ووشکی ڕوویان تێ نەکات.

فەرموودەیەی کە ئیمامی "موسلیم" لە صەحیحەکەیدا هێناویەتی لە هەندێ لە دایکانی بڕوادارانەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: " مَن أتَى عرّافاً فسألَهُ عن شيءٍ، لم تُقبَلْ له صلاةٌ أربعينَ لَيلةً "[1].

واتە: هەرکەسێك بچێ بۆ لای "جادووگەرێك"،و پرسیاری لێ بکات لەبارەی شتێکەوە هەتا ئەو جادووگەرە بۆی ئەنجام بدات، ئەوا ئەو کەسە لەو کاتەوە کە چووە بۆ لای ئەو جادووگەرە تا "٤٠" شەو بەڕۆژەکەیشیەوە هیچ نوێژێکی لێ وەرناگیرێ.

وە لەنێو خەڵکیدا کەسانێکی وا هەیە دەچێت بۆ لای فاڵچییەك هەتاوەکو فاڵێکی بۆ بگرێتەوە، لەبارەی زانینی پاشە ڕۆژییەوە کەچی بەسەردا دێت، وە فاڵچییەکەش پێی دەڵێت: ئابەو شێوە ژن دەهێنی، وە ئەوەندە منداڵتان دەبێ، و وەێنەی ئەمانە.

وەئەمەش کوفرو بێ باوەڕی کردنە بەرامبەر بەخوا، لەبەرئەوەی شتە غەیبی و پەناهەندییەکان "الغیب" هیچ کەسێك نایزانێ جگە لە (الله) نەبێ.

ئەمەش بەبەڵگەی ئەو فەرموودەی کە ئیمامی "ئەحمەد و حاکیم" گێڕاویانەتەوە، وە شێخ ئەلبانیش لە (صحیح الجامع) دا بە صەحیحی داناوە لە (ابی هریرە)وە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (مَنْ أتَى عَرّافاً أو كاهناً، فصدقَهُ بما يقولُ فقد كفَرَ بما انزلَ على محمدٍ (ﷺ)[2]).

واتە: هەر کەسێك بچێت بۆ لای جادووگەرێك، یاخود فاڵچییەك، وە باوەڕبکات بەو قسانەی کە ئەو جادووگەرە دەیان ڵێت، ئەوا ئەو کەسە کافر بووە بەو قورئانەی کە بۆ محمد (ﷺ) هاتووە[3].

---

[1] حديثٌ صحيح: رواه مسلم واحمد، وە لە(صحيح الجامع) دا بە ژمارە (٥٩٤٠) هاتووە.

[2] حديثٌ صحيح: رواه احمد والحاكم. وە لە (صحيح الجامع)دا بەژمارە (٥٩٣٩).

[3] هەندێك لە جۆرەکانی سیحرو چوون بۆ لای ساحیر لای خەڵکی:

## ١٩- باوەڕبوون لە بەردا: الاعتقادُ في الحجارة

بەڕاستی لەناو ئافرەتاندا کەسانێکی وا هەیە، ئەگەر منداڵ بوونی دواکەوت پەنا نابات بۆلای خودا تا لێی بپاڕێتەوە،ووەلێی هەڵ کوڕێت، بەڵکو پەنا دەبات بۆ کۆمەڵێ بەرد کە بەیەکەوە بەستراون، و وەناویان لێ ناوە:(فرعُ الكبسة)[1]،واتە: ئەم منداڵ نەبوونەش فەرعێکە و بەشێکە لە

---

- هەندێك لە خەڵکی بە مەبەستی زانینی پاشەڕۆژی دەچێت بۆ لای خەڵکانی جادووگەر، ئەویش فاڵو جادووییەکیان بۆ دەگرێتەوە لەڕێی قاوەوە، کە پێی دەوترێت: قاوە گرتنەوە.

- یاخود هەندێك کەس کە دەچن بۆلای فاڵچی، ئەو فاڵچییە سەیری ناو لەپی دەستی ئەو کەسە دەکات، ئەمجا بەگوێرەی ئەو خەتانەی کە لەدەستی ئەو کەسەدا هەیە، جادووگەرەکە ڕووداونی ڕووداوەکانی پاشەڕۆژی ئەو کەسە بەدرۆ بۆی باس دەکات، بۆ نمونە: دەڵێت تۆ دوو خەتی درێژو گەورە لەدەستدا هەیە واتای ئەوەیە کە تۆ دوو شوو دەکەی، یا دووجار تەلاق دەدرێی، یان دووجار ژن دەهێنی ئەگەرئەوکەسە پیاوبوو.

- یاخود جۆرێکی تر لە سیحر هەیە لەناو خەڵکیدا کە کەم لە خەڵکی دەزانن ئەو شتە سیحرە، ئەویش ئەوەیە کە پێی دەوترێت: لەرز بڕین، کە بریتییە لەوەی کە کەسێك کە تووشی لەرزوتا دەبێت، دەچێت بۆ لای ئەو کەسانەی کە ئەو لەرزە بۆ خەڵکی دەکەن تالەرزێکی بۆ ببڕێت، کە پێك هاتووە لە تاڵێك دەزوو کەکۆمەڵێك گرێی لێ دەدرێ، وەلەگەڵ لێدانی هەرگرێیەکدا ئەو کەسە چەند قسەیەك دەڵێت بە سەر دەزووەکەدا کە بەحساب دوعا دەکات، دوای ئەوە ئەو دەزووە دەدات بەو کەسەکەی کە لەرزی لێ هاتووە ئەویش دەیکاتە دەستی وەکو بازنە، پاشان کابرای لەرزبڕ داوای شتێك لەو کەسە دەکات، ئیتر پارەبێت یان کلۆیەك شەکر بێت وە دەیخوات، وە دەڵێت: بۆ ئەوەی لەرزەکە نەیەت بۆ خۆم.

- یاخود زۆربەی ژنان، کاتێك کە منداڵەکەی ڕەنگی زەرد بوو یان تووشی سك چوون بوو، یەکسەر ئەڵێت :منداڵەکەم بە بۆن کەوتووە!! ئیتر نای بات بۆ

کەپسبوون و پەستاوبوون و گیران ، وە ئەو کۆمەڵە بەردە بەئاو دەشۆرن و پاشان بەو ئاوە ئافرەتەکە خۆی پێ دەشوات، بەگومانی ئەوەی ئەم کارە بەستن و گرێدانی لەمناڵ نەبوون هەڵدەوەشێنێتەوە و وە منداڵ نەبوونەکەشی بەر دەبێت .

وە ئایا نازانێت کە خوای گەورە تەنها خۆی ﴿يَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ إِنَاثاً وَيَهَبُ لِمَن يَشَاءُ الذُّكُورَ، أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَاثًا وَيَجْعَلُ مَنْ يَشَاءُ عَقِيمًا﴾ (الشورى: ٤٩-٥٠).

واتە: پەروەردگار هەرچییەکی ویست لەسەر بێت دروستی دەکا و دەیهێنێتە بوون، تەنها کچ بەو کەسە دەبەخشێت کەخۆی بیەوێت، وە بەو کەسەی

---

نەخۆشخانە، بەڵکو دەیبات بۆ لای ژنە گاورەکەن یان ژنە قەرەجەکە، یان حەلاوە مەرگەیی، بەڵکو ئەمان سکچونی منداڵەکەی شیفا بدەن، ئەوانیش دەرمانی جۆراو جۆری بۆ دەگرنەوەو وە نوشتەو سیحری بۆ تێکەڵ دەکەن، ودەڵێن بەدایکی منداڵەکە کە: ئەم دەرمانانەی بۆ ببەرەوە ڕۆژی ئەوەندەجار بیدەرێ، ئیتر چاك دەبێت، پاشان پارەیەکی زۆری لێ دەستێنن ، بەڵام دایە "قل قل" نازانێ بەملی شکاوی "ژنەکەرە" کە سیحری لە منداڵەکەی کردووە، وە هەتا ئەو منداڵە لەژیاندا بێت ئەو سیحرەی هەر لەگەڵدا دەبێت مەگەرخوا ڕزگاری بکات.

– یاخود کە ئەو جادووگەرانە سیحر یان بۆ هەر کەسێك کرد شوێنی شاردنەوەی سیحرەکەش بەو کەسە دەڵێن، بۆ نموونە: دەڵێت: با باش کاریات تێ بکات بچۆ ئەم نووشتە لە پشتی قەبری منداڵی نەباڵغ بوەوە بیشارەوە، یاخود هەموو ئێوارەیەك پاشماوەی خواردنی سەر سفرەکەتان ڕۆبکەنە بەردەم دەرگای ئەوماڵەی کە سیحرەکەی لێ دەکەیت.

– یاخود ئەگەر ویستت بزانێ کە سیحرت لێ کراوە ئەوا ئەگەر پشیلە بەماڵت فێرببێت، ئەوا نووشتەت لێکراوە.

کەخۆی بیەوێت تەنها کوڕی پێ دەبەخشێت، یان بۆ هەندێکیش کوڕیش و کچیشیان پێ دەبەخشێت، وە بۆ هەر کەسێکیش کە خۆی بیەوێت لەپیاوو ئافرەت نەزۆك و بێ وەچەیان دەکات.

بڕوانە ئەو پێغەمبەرەی خودا (زەکەریا) -سەلامی خوای لێ بێت- بەوەجاخ کوێری مابووە منداڵی نەبوو، هەتا سەری سپی بوو، وە ئێسقانەکانی لاشەیشی بێ هێزو بەرەو پوکاندن دەچوو، وە پشتیشی چەمیبۆوە، وە لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا بێ هیوا نەبوو لە ڕەحمەت و بەزەیی پەروەردگارەکەی، وە بە بەردەوامی دەپاڕایەوە و هەڵ دەکوڕا لێی هەتا خودا منداڵێکی پێ ببەخشێت، تا ببێتە جێنشین و میراتگری پێغەمبەرایەتیەکەی لەدوای خۆی، وە هەتاوەکو پێغەمبەرایەتی نەپچڕێت لەوەچەکانی باوانی کە "یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم"ە - سەلامی خوایان لێبێت-.

لەئەنجامدا خوای گەورە ڕەحمی پێکردو، وەڵامی پاڕانەوەکانی دایەوە،و وە (یحیی)ی پێ بەخشی. وەکردیشی بە پێغەمبەر بۆ ئەوەی کە جێنشینی باوکی بێت لەدوای مردنی. خوای گەورە لەبارەی پێغەمبەر "زەکەریا"وە دەفەرمووێت : ﴿ذِكْرُ رَحْمَةِ رَبِّكَ عَبْدَهُ زَكَرِيَّا﴾، واتە: ئەمە باسی ڕەحمەت و بەزەییی پەروەردگارەکەتە، دەربارەی بەندەی خواناسی خۆی، کە زەکەرییایە.

﴿إِذْ نَادَى رَبَّهُ نِدَاءً خَفِيًّا﴾، واتە: کاتێك کە بەنهێنی و پەنامەکی لەپەروەردگاری خۆی دەپاڕایەوە، کە بەڵکو خوای پەروەردگار منداڵێکی پێ ببەخشێت.

﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ الْعَظْمُ مِنِّي وَاشْتَعَلَ الرَّأْسُ شَيْبًا وَلَمْ أَكُنْ بِدُعَائِكَ رَبِّ شَقِيًّا﴾ ، واتە: لەخودا پاڕایەوەو وە وتی: ئەی پەروەردگارم! بەڕاستی

من ئێسقانەکانی لاشەم بێ هێزبوون، و بەرەو پۆڵکین دەچن، وە خۆیشم هێـزم تێدانـەماوە، وەپـیرو کەنەفـەت بـووم، وە مووەکـانی سـەرم بەتـەواوەتی سـپییەتی دایگرتـووە و سـپی بـووە، لێت دەپاڕێمـەوە کـە منداڵێکم پێ ببەخشی، من هیچ کاتێك لە ئاکامی پاڕانەوە و دوعاکانم دا بۆلای تۆ نائومێدو بێ هیوا نەبووم.

﴿وَإِنِّي خِفْتُ الْمَوَالِيَ مِنْ وَرَائِي وَكَانَتِ امْرَأَتِي عَاقِرًا فَهَبْ لِي مِنْ لَـدُنْكَ وَلِيًّا﴾ ، واتە: وە بەڕاستی من لەوە دەترسم کە خزمە نزیکەکانم لـەدوای مردنـی مـن یـاخی بـبن و ڕوو بکەنـە خراپـەو، وە کاروبـاری ئـەم ئاییـنـە بەباشی ئەنجام نەدەن، وە پاش مردنم واز لەبانگەوازی کردن بۆ ئایین و خـودا پەرستی بهێـنن، سـەرباری هـەموو ئەمانـەش بـۆ خـۆم پـیر بووم و پەکم کەوتووە، وە خێزانەکەشم نەزۆکەو منـداڵی نـابێ، خودایـە! کـەس نییە لەدوای خۆم ببێ بەجێنشینم، خودایە! لەلایەن خۆتەوە بەبەزەیی و ڕەحمەتی خۆت لەپشتی خۆم منداڵێکم پێ ببەخشە.

﴿يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنْ آلِ يَعْقُوبَ وَاجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيًّا﴾، واتە: هەتا ئـەو منداڵـە ببـێ بـەمیراتگری پێغەمبەرایـەتی لـەمن و وە لەنـەوەی یـەعقوب، پەروەردگار! داوات لێ دەکەم منداڵێکی وام پـێ ببەخشی، کە ڕاستگۆ و خواناس و ساڵیح بێ، وە تۆ لە کردەوەکانی ڕازی بیت.

لەپاداشتی ئەوەی کە بەتـەنها ڕووی کردە خـوا وە بەتـەنهاش داوای لـە خـوداکرد، خـوای گـەورەش دەست بـەجێ وەڵامـی پاڕانەوەکـەی دایـەوە بـەوەی ﴿يَا زَكَرِيَّا إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَامٍ اسْمُهُ يَحْيَى لَمْ نَجْعَلْ لَهُ مِنْ قَبْلُ سَمِيًّا﴾، واتە: خودا نیگای بۆ ناردو پێی فـەرموو: ئەی زەکـەریيا! ئێمە مـوژدەت

دەدەینیٚ بە کورێك، کە ناوی "یەحیا"یە، کە پێشتر ئەو ناوەمان لەهیچ کەسێك نەناوە.

پێغەمبەر "زەکەریا"ش بەم مژدە سەری سوڕما، کە خۆی دەبینی لەسەر ئەم حاڵەیە ووە کە کەسێکی بەساڵاچووە، وەخێزانەکەشی ئافرەتێکی نەزۆکە ووە منداڵی ئیتر نابێت، ئەمجا پێغەمبەر زەکەریا فەرمووی: ﴿رَبِّ أَنَّى يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَكَانَتِ امْرَأَتِي عَاقِرًا وَقَدْ بَلَغْتُ مِنَ الْكِبَرِ عِتِيًّا﴾ ، واتە: زەکەریا لەخۆشیدا فەرمووی: ئەی پەروەردگارم! چۆن من منداڵم دەبێت،خێزانەکەم لەتەمەنی گەنجیشیدا هەر نەزۆك بووە، وە ئێستاش کە بۆتە پیرەژن چۆن منداڵی دەبیٚ؟ وە خۆیشم ئەوەندە بەتەمەنم پەکم کەوتووە و ووشك بوومەتەوە.

بەلاٚم خوای گەورە پێی فەرموو: ﴿قَالَ كَذَلِكَ قَالَ رَبُّكَ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِنْ قَبْلُ وَلَمْ تَكُ شَيْئًا﴾ (مريم: ٢-٩) ، واتە: ئەو ملائیکەتەی کە نیگاکەی بۆ دەهێنا پیٚ فەرموو: هەر بەو شێوای کە موژدەت پیٚ دراوە خوا بۆت دێنێتە جیٚ، پەروەردگارت دەفەرموێت: ئەنجامدانی ئەم کارە زۆر ئاسانە بەلای پەروەردگارەوە، وە بێگومان من (پەروەردگار) پێشتر تۆم لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون، وە من تۆم دروست کردووە بەبیٚ ئەوەی هیچ بوونێکت هەبووبێت.

## ٢٠- باوەڕبوون لە وێلاشی[1] مەڕو مالآتدا: الاعتقادُ في المَشِيمَة

هەندێ لەجووتیارەکان ئەگەریەکێك لەئاژەڵەکانیان بەچکەیەکی بوو، دەچێت پارچەیەك لەوێلآشی ئەو ئاژەڵە دەبڕێت و، وە لەگەڵ چەند کلۆیەك خوێدا هەردوکیان بەیەکەوە دەبەستێت، پاشان دەیانخاتە ناو تورەکەیەك، یاخود پریاسکەیەکی قوماشەوە، وە هەڵی دەواسێت بەملی ئاژەڵەکەیدا، بەباوەڕی ئەوەی کە ئەم شتە شیری ئاژەڵەکەی زۆر دەکات ﴿ساءَ ما يعملونَ﴾ (المائدة: ٦٦)، واتە: بەڕاستی ئەمە خراپترین کارە کەئێوە ئەنجامی دەدەن.

## ٢١- باوەڕبوون لە ئێسقاندا: الاعتقادُ في العظام

هەندێ لەجووتیاران – خوا هیدایەتیان بدات- کاتێ کە سەوزەی باخەکەی یاخود تەماتەکەی یاخود باینجانەکەی، بەرهەمەکەی لاواز دەبێت، یاخود تامەکەی تاڵ دەبێت، دەڕوات ئێسقانی کەر یاخود سەگ... –خوا ڕێزدارتان بکا– دەهێنێ و ئاگریان پێوە دەنێت ووە دەیان سووتێنێ، پاشان خۆڵەمێشی ئەو ئێسقانانەی کە سووتاوە دووکەڵی لێ هەڵدەستێ و دەیبات بەناو هەموو باخەکەیدا دەیگێڕێت، هەتاوەکو ئەو دووکەڵە بچێت بەسەر بەروبوومی باخەکەیدا، بەباوەڕی ئەوەی ئـا ئەم کارە بەرهەم و بەروبوومی باخەکەی بەهێز و چاك دەکات، لەدوای ئەوەی کە لاوازبوو بوو بەرهەمەکەی، وە تامەکەیشی دەگۆڕێت بۆ خۆش

---

[1] وێلآش: بریتییە لەو توورەکەیەی کە کاتێ بەچکەی ئاژەڵە کە لەدایك دەبێت لەناو ئەو توورەکەدایە و دێتە دەرەوە، پاشان کە بەچکەکەیان دەرهێنا تیایدا، توورەکەکە فڕێ دەدەن.

و بەتام وبەچێژ لەدوای ئەوەی کەوا تامەکەی تاڵ وبێ تام بوو بوو[1] ﴿ساءَ ما يحكـون﴾ (الانعام: ١٣٦)، واتە:بەڕاستی ئەمە خراپترین حوکمدانە کە ئێوە بەو شێوە ئەنجامی دەدەن[2].

## ٢٢- باوەڕبوون لە مۆم دا: الاعتقادُ في الشُمُوع

هەندێ لەخەڵکی ئەگەر منداڵێکیان بوو، یاخود ئەگەر ویستیان ناوێکی بۆ هەڵبژێرن، دەچن کۆمەڵێك مۆم دەهێنن، وە بۆ هەر مۆمێك ناوێکی لێ دەنێن، پاشان هەموویان دادەگیرسێنن، وە کام مۆم لەو مۆمانە زوو کوژایەوە لەو ناوە ڕەش بین دەبن کە ناویان ناوە لەومۆمە، لەبەرئەوەی زوو مۆمەکە کوژایەوە کەوابوو تەمەنی مۆمەکە کورت بوو، وە ئەگەر ناوی ئەم مۆمە زوو کوژاوەیە بنێن لەمنداڵەکەیان، ئەوا تەمەنی منداڵەکەشیان وەکو تەمەنی ئەو مۆمە کورت دەبێت بەبۆچوونی ئەوان.

وە لەدوایدا بۆچوون و بڕیاریان دەچێتە سەر ناوی ئەو مۆمەی کە لەدوای هەموو مۆمەکانەوە دەکوژێتەوە، وە ئەو مۆمەی کە درەنگ

---

[1] خوای گەورە بڵێی لەم جۆرە سەوزەو میوە لەمیسرەوە نەهاتبێ بۆ کوردستان.

[2] باوەڕبوونی پووچ لەئێسقاندا:-

لەهەندێك شوێنی کوردستاندا، خەڵکی چوون بۆ ڕاوی پەپوەسلێمانکە، کە ڕاویان کردووە، ئەمجا سەریان بڕیوە و وە خستویانەتە ناو ئاوێکی گەرمەوە، تا گۆشتەکەی لە ئێسقانەکەی جیا بۆتەوە، دوای ئەوە وەستاون بەلای ئەو مەنجەڵەی کە گۆشتی پەپوەکەی تیادایە، تا یەك ئێسقان لە ئێسقانەکانی سەر ئاو بکەوێت، کە یەك ئێسقانی سەر ئاوەکە کەوتووە، ئەو ئێسقانەیان لەئاوەکە دەرهێناوە و لەپەڕۆیەکیان پێچاوەو هەڵیان گرتووە، بەباوەڕی ئەوەی کە ئەم ئێسقانە پیرۆزە و وە ڕزق و ڕۆزیان زیاد دەکات، یان نیازو مەبەستی ژن و مێردایەتی حاصل دەبێت و دێتەجێ بەهۆی ئەم ئێسقانەوە.

کوژایەوە کەوابوو تەمەنی مۆمەکە درێژ بوو، وە تەمەنی منداڵەکەشیان درێژ دەبێ، ئەگەر بەناوی ئەو مۆمە تەمەن درێژەوە ناویان لێ نا ، باشە ئایا مۆم علیمی غەیب دەزانێ ؟! .
وە ئایا شتی بێ رۆح و بێ گیان تەمەنی وەچەکانی باوکە ئادەم دەزانێ؟ .

## ٢٣- باوەڕبوون لەوەدا کە شەیتان هەندێ بەرووبووم و ڕووەك دەڕوێنێ:

لەنێو جووتیارەکاندا کەسانێکی وا هەیە بەهەندێ لە بەرووبووم و ڕووەك کە ڕووا بێت، وە بەبێ ئەوەی جووتیارەکەش دەستی هەبێت لەڕواندنیدا بەو ڕووەکە دەڵێ: (شیطانیٌّ)، واتە: ئەم ڕووەکە شەیتان کردە، وە ئەمەش هەڵە و پەڵەیە، لەبەرئەوەی شەیتان هیچ بەروبووم و ڕووەکێك ناڕوێنێ، وە دەبێ بەو ڕووەکە بڵێی: (ربّانیٌّ) واتە: خوا کردە.
خوای گەورە و میهرەبانیش دەفەرمووێ: ﴿أَفَرَأَيْتُمْ مَا تَحْرُثُـــونَ﴾، واتە: ئایا نابینن: ئەو شتانەی کە ئێوە دەیچێنن.
﴿أَأَنْتُمْ تَزْرَعُونَهُ أَمْ نَحْنُ الزَّارِعُونَ﴾، واتە: ئەرێ ئێوە ئەو تۆو بەروبووم و ڕووەکانە دەڕوێنن، یان ئێمە دەیان ڕوێنین.
﴿لَوْ نَشَاءُ لَجَعَلْنَاهُ حُطَامًا فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُـــونَ﴾، واتە: خۆ ئەگەر بمانەوێت ئەوەی کە ئێوە دەیچێنن و دەیڕوێنن ووشکمان دەکردو دەمان کردەوە بەپووش و پەلاش، وە هیچ سوودێکتان لێ نەدەبینی.
﴿إِنَّا لَمُغْرَمُونَ﴾،واتە: ئەو کاتە ئێوە سەرسام دەبوون و دەکەوتنە قسەو باس لەناو خۆتاندا، کە بۆچی وای لێهات و وەبۆچی وای بەسەر هات،

وە دەتیان ووت: بەڕاستی ڕەنجەڕۆ و مایە پوچ بووین﴿بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ﴾ (الواقعة:٦٣- ٦٧).

واتە: بەڵکو دەتان ووت: بەڕاستی ئێمە بەتیاچوونی بەروبووم کشتوکاڵەکەمان خۆشمان تیادەچین و دەفەوتێین.

## ٢٤- باوەڕبوون لەخوێن دا: الاعتقادُ في الدّماء

لەناو خەڵکیدا کەسانێکی وا هەیە ئەگەر ئاژەڵێکی سەربڕی دەستی نوقم دەکا لەخوێنی ئەو ئاژەڵەدا، وە بەدەستە خوێناوییەکانی دیواری خانووەکەی پێ خوێناوی دەکات[1]، بەباوەڕی ئەوەی ئا ئەم کارە بەرەکەت بۆماڵەکەی دەهێنێ!!.

وە بێ گومان هەموو شتێکیش ئا لەم شێوازانە یەکێکە لە دواکەوتووی و سەرپووچی سەردەمی جاهلیەتی یەکەمی پێش هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، وە ئەم کارە پووچە ئەو بیدعەیەم بیردەخاتەوە کە میصری یەکۆنەکان دایان هێنابوو، ئەویش ئەوەبوو عادات و نەریتیان وابوو هەموو ساڵێك کچۆڵەیەکیان فڕێ دەدایە ناو ئاوی ڕووباری نیلەوە، ئەویش لەبەر وەفاو دڵسۆزی خەڵکی میصربوو بۆ ڕووباری نیل کە چەندە لەو ئاوەی پێشکەش بەخەڵکی میصر دەکات، کە بەهۆی ئەو ئاوەیەوە ژیانیان و گوزەرانیان بەڕێوە دەچوو، وە ئەو ڕۆژەی کە ئەم کارەیان تیادا ئەنجام دەدا ناویان لێ نابوو (عیدُ وفاء النیل)، واتە: جەژنی بەوەفاو بەئەمەك بوون بۆ ڕووباری نیل.

بەڵام کاتێ موسوڵمانان لە ساڵی ٢٠ی هیجریدا وڵاتی میصریان ئازادکرد، ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئەم بیدعەیەی پووچەڵ کردەوە،

---

[1] بە شێوەی چەمۆڵە دەست ئەو خوێنی ئاژەڵە دەدەن لە دیواری ماڵەکەیان.

پاشان خەڵکەکەی هاتن بۆ لای والیی میصر کە (عەمری کوڕی عاص) بوو، کاتێك کە پێیان نایە ئەو مانگەی کە ئەم کارەیان تیادا ئەنجام دەدا، کە ناوی مانگی بؤنة بوو (شهرُ بؤنة)، وە بەعەمری کوڕی عاص یان ووت: ئەی پێشەوا!! بۆ ئەم ڕووباری نیلەی ئێمە ساڵێك هەیە ئاوەکەی کەم دەکاو لەبەری ناڕوات جگە بەو کارە نەبێ ئاوەکەی زیاد ناکاتەوە، عەمریش فەرمووی: ئەو کارە چییە؟!! .

وتیان: کاتێك دوانزە مانگی ساڵ تێ دەپەڕێت و دەگەینەوە بەم مانگی (بؤنة)ی کە ئێستا وەهاین تیایدا، دەچین کچۆڵەیەکی نۆبەرە لەدایك و باوکی وەردەگرین، و وە دایك و باوکی ڕازی دەکەین، وە ئەو کچە دەڕازێنێنەوە بەجوانترین و چاکترین خشڵ و پۆشاکێك کە هەیبێت و دەست بکەوێت لامان، پاشان فڕێی دەدەینە ناو ئا ئەم ڕووباری نیلەوە.

عەمریش فەرمووی: ئا ئەمە کارێکە کە نابێ بکرێت لەئیسلامدا!، چونکە ئیسلام ڕوخێنەری ئەوکارە خراپانەیە کە لەپێش هاتینیدا هەبوون.

پاشان تا ماوەی سێ مانگ وەستان مانگی (بؤنە و ئەبیب و مەسرا) ڕووباری نیل نە کەم ئاوی لەبەر دەڕۆیی، وە نەزۆر، هەتاوەکو خەڵکی کەوتنە دوو دڵییەوە کەوا چۆڵی بکەن ووە ماڵ و حاڵیان بەجێبهێڵن، ئەمجا عەمر ناچار بوو نووسراوێك بۆ خەلیفە "عومەری کوڕی خەتاب" بنووسێ لەم بارەیەوە.

وە ئیمامی عومەریش نووسراوێکی نووسییەوە بۆ عەمر ووە بۆی نارد، کە تیادا نووسی بووی: بەڕاستی تۆ توش بووی بەشتێکەوە کەوا پیادەو کردووە و نەتهێشتووە ئەو کارە بکەن، وە من پارچە

نووسـراوێکم بـۆ نـاردووی کـه لـه‌ناو ئـه‌م نووسـراوه‌مدایه‌،وه ئـه‌و پارچـه نووسراوه که ده‌رتهێنا فڕێی بده‌ره ناو ڕووباری نیله‌وه.

کاتێك که نووسراوه‌که‌ی ئیمامی (عومـه‌ر) گه‌یشته میسر، عه‌مر پارچه نووسراوه‌که‌ی تیادا ده‌رهێناو، وه ئه‌مه‌ی تیادا نووسرابوو: (لـه‌به‌نده‌ی خـوداوه عـومـه‌ر! پێشه‌وای بـاوه‌ڕداران بـۆ ڕووبـاری نیلـی خـه‌ڵکی میـسر، پاشان له‌دووایدا: ئه‌گه‌ر تۆ ئـه‌و ئـاوه‌ت کـاتێ زۆر ده‌بـێ و فـواره ده‌کـاو له‌به‌رت ده‌ڕوات، به‌ویستی خۆت و به‌فه‌رمانی خۆت ئاوه‌که‌ت زیـاد ده‌کـات، بـا ئه‌و ئاوه‌ت ئیتر لـه بـه‌ر نـه‌ڕوات و ووشـك بکـات، وه ئێمـه‌ش ئـیتر هـیچ پێویستییه‌کمان به‌ئاوی تۆ نییه، خۆ ئه‌گه‌ر ئاوه‌که‌ی تۆ به‌فه‌رمانی خوای تاك و ته‌نهاوبه‌توانا له‌به‌رت ده‌ڕوات، ووه ئاوه‌که‌ی تۆ زۆر ده‌کات، ئـه‌وا داواکـارین له‌خوای به‌رزو بڵند که‌وا ئه‌و ئاوه‌ت زۆر بکات و فواره‌ی پێ بکاو وه له‌به‌رتی بڕوێنێ).

ئه‌مجا عه‌مریش ئه‌م پارچه نووسراوه‌ی فڕێ دایه نـاو ڕووبـاری نیلـه‌وه، وه کـاتێ بـه‌یانی ڕۆژی شـه‌ممه[1] بویـه‌وه خـوای گـه‌وره له‌یـه‌ك شـه‌ودا شـانزه گـه‌ز[2] ئـاوی ڕووبـاری نیلـی زۆر کردبـوو، ئه‌وه‌نـده مـاوه بڵـێین: ﴿قُلْ جاءَ الحق وزهق الباطل، اِنّ الباطل كان زهوقاً﴾ (الاسراء: ٨١).

واتـه: ئـه‌ی ئـه‌و که‌سـه‌ی کـه بـاوه‌ڕت بـه ڕاستییه‌کان هێنـاوه، بڵـێ بـه‌و که‌سانه‌ی که شوێن پڕوپوچی که‌وتوون: ئـه‌وا حـه‌ق و ڕاستی هـات و

---

[1] وه‌ك دیاره لـه ڕۆژی هـه‌ینی دا ئـه‌م پارچـه نووسراوه‌یان فڕێداوه‌تـه نـاو ڕووباری نیله‌وه.

[2] گه‌ز: بریتییه له‌یه‌ك مه‌تر، واتـه: له‌یـه‌ك شـه‌ودا خـوای گـه‌وره شـانزه مـه‌تر ئـاوی به‌به‌رزایی‌و پانتایی ڕووباری نیل زیادکرد بوو.

چەسپاو، وە ناڕاستی و باطیلیش پوکایەوە و شکستی هێناو نەما، چونکە بەڕاستی باطیل و ناڕاستی ئاکام و سەرئەنجامی هەر پووکانەوە و قەلاچۆ بوون و تیاچوونە[1] [2].

---

[1] ئەم ڕووداوە لە پەرتووکی (البداية و النهاية)ی ئیبنو کەثیردا هاتووە (١٠٢/٧).

[2] پوچەڵە بیروباوەڕ لای ئێمە لە خوێن دا:

لای هەندێك خەڵك بەتایبەتی ئەو کەسانەی کە دەوڵەمەندن، کە خانوویەکیان کردەوە، ئەو کاتەی کە خانووەکەیان تەواو بوو پێش ئەوەی بەماڵەوە بچنە ناوی ، دێن مەڕێك یان دوو مەڕ دەهێنن، و دەیبەنەسەرەوە بۆ سەربانی خانووەکەیان و ئەمجا بەسەر دیواری خانووەکەیاندا سەری دەبڕن، بۆئەوەی خوێنەکەی بەدیواری خانووەکەدا بێتە خوارەوە، یاخود دەستیان لەخوێنەکەی هەڵدەکێشن و وە بەشێوەی چەموڵەی دەست دەیدەن لە دیواری دەرەوەی خانووەکەیان، بە گومانی ئەوەی ئەگەر حەسوودییان پێ بڕا، بەڵکو ئەم خوێنە ئەو حەسودییەیان بۆ بگێڕێتەوە، وەیان ئەم خوێنە خێرو خۆشیان بۆ بهێنێ.

بەلام بۆ زۆربوونی ئاو لای هەندێك لەخەڵکی ئێمە، ئەوەیە:

لەهەندێك لەلادێکان نەریتیان وابووە ئەگەر ئاوی لادێکەیان کەمی کردبێت،ووە وەختی ئەوەش بووبێت کە ئاوو کانیاو زۆر ببێت و بتەقێ بەتایبەتی لەبەهاراندا، هاتوون پیاوانی ئەو لادێیە لە مزگەوتی لادێکە کۆبوونەتەوە لەو شوێنەی کە دەست نوێژی لێ دەگرن، کە شوێنی دەست نوێژکردن لە مزگەوتی لادێکاندا بەزۆری وەکو حەوزی مەلەکردن دروست دەکرا، وە هەر کەسێك کە دەچێت دەستی تێدەخات و وە دەست نوێژی لێ هەڵ دەگرێت، ئەمجا هاتوون ئەو خەڵکە شێخێکی ئەو لادێیەی خۆیان هێناوە، و بەهەموویان تاویان داوەتێ و وەچوارپەلیان گرتووە، و بەسەردا و وەبەجل و پێلاوییەوە هەڵیان داوە بۆناو ئەو حەوزەی دەست نوێژگرتنەکە، بەباوەڕی ئەوەی کە خودا بەهۆی" کاکە شێخەوە" ئاویان بۆ زۆر بکات و ئەو حەوزەیان بۆ پڕبکات لەئاو، ئیتر حەوزەکەش کەمێك ئاوی تیابووە کاکە شێخ لە ئاو هەڵکشاوە و وە جاری وا هەبووە لەدووسێ شوێنیشەوە سەریشی شکاوە.

## ٢٥- بـاوەڕبـوون لـەخۆردا : الاعـتـقـادُ في الـشَمس

هەنـدیٚ لـە خـەڵكی باوەڕیـان وایـە كـە (خـۆر) هەنـدیٚ لـە ئەندامـەكانی لاشەی مرۆڤـ دروست دەكات، هەر كاتیٚ ددانێك یاخود خرێیەكی كوڕە بچكۆلانەكەی كەوت، پێی دەڵێت: ددانەكەت ببەو فڕێی بدەرە بەرتیشكی خۆرو بڵیٚ: (یـاشمسُ یاشموسةُ) واتـە: ئەی خۆر! ئەی خۆرەتاو!، ددانی كەریەتی ببەو ددانی بووكەڵەم بۆ بهێنە.

ئـا بـەم شێوەیە كـاتیٚ كـە ئـەو منداڵـە پێـدەگاو گـەورە دەبـیٚ، دەبێـت بەبیروباوەڕ لەلای كەخۆر ددان دەبەخشیٚ بەمرۆڤـ !![1].

---

[1] لای خـەڵكی ئێمـە باوەڕیـان بـەخۆر نییـە بـۆ ددان ڕوانـدن، بـەڵام كۆمـەڵێك بیروباوەڕی پڕوپووچی تریان هەیە بۆ ددان ڕووان، وەكو:

- هەنـدێك لەخـەڵكی باوەڕیـان وایـە، ئەگـەر منداڵەكـەیان وەخـت و كـاتی ددان دەرهـاتنی نزیـك بۆیـەوە، پێیـان دەڵـێن: گۆشـتی چۆلەكەی بـدەنیٚ، بـازوو ددانـی دەربێـت، ئـەوانیش دەچـن چۆلەكەیەكی بـۆ دەكـوژن، و وە بـۆی سـووردەكەنەوە و ئەمجا گۆشتەكەی دەدەنیٚ، بۆئەوەی زوو ددانی دەربێت (ئاخر خەڵكینە چۆلەكەی داماو چی پیٚ دەكرێت، خۆی ددانی لەدەمدا نییە ئیتر چۆن دەتوانێت گۆشتەكەی ددانی منداڵ بڕوێنێت).

- یـاخود كـە منداڵەكـەیان ددانێكـی لـەدەمیا سـەری دەرهێنـا، دایكـی دەچـێت دانەڕۆكەی بۆ دەكات، كە بریتییە: لە گەنم و نۆك بەیەكەوە دەیكوڵێنن هـەتا وەكو نیـسكێنەی لیٚ دێـت، ئـەمجا دایكـی بەسـەر ماڵـە دراوسـێكانیاندا قـاپ قـاپ دەیبەخـشێتەوە، بـاشە بـۆ ئـەم دانەڕۆكەیـە دەكـەیت؟ دەڵـێن: بۆئـەوەی تاسـەری منداڵەكـەی نـەرم ببێـت و زوو ددانـەكانی بێتـەدەرەوە، وە دەبێـت كـە دراوسـێكان قاپەكەیان ناردەوە نابێت بەخاڵی بینێرنەوە، دەبێـت هەریەكە پارەیـەك یـان شتێكی تێبكاتەوە نەگین خراپە!!.

## ٢٦- باوەڕبوون لەوەدا کە ئەگەر پەرداخ بشکێ شەڕی لەگەڵ خۆیدا بردووە:

ئەم نەریتەی هەندێ لە خەڵکی ئەگەر قاپێك، یاخود پەرداخێکیان بەدەستیانەوە شکا دەڵێن: (اخذ الشَّرَو راحَ)، واتە: شەڕی لەگەڵ خۆیدا بردوو ڕۆیی.

کەچی قاپ و قاچاخ هیچ پەیوەندییەکی نەبەخێرەوە هەیە وە نە بەشەڕیشەوە هەیە، بەڵکو خێرو شەڕ بەتەنها ئەندازەگیری کراوە لەلایەن خوای گەورەوە،وە خوا دەفەمووێ﴿وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ (الانعام: ١٧) ، واتە: ئەگەر پەروەردگار ویستی تووشی ناخۆشی و شەڕو ناڕەحەتی و زەرەرو زیانێکت بکا، ئەوا هیچ هێزو تواناو دەسەڵاتێك

---

پاشان گەشبینی و ڕەشبینی لەددانـدا لای خەڵکی ئێمە:

- هەر کەسێك ددانی شاش بێت، بەو کەسە دەڵێن: ددانی شاشە بەختی باشە، بەڵام ئەگەر ددانی شاش نەبێت، پێی دەڵێن: ددانی ڕیزە بەختی". ...... ".

- دەڵێن منداڵ دەبێ یەکەمجار ددانی بەری خوارەوەی دەربێت، خۆ ئەگەر هاتوو ددانی بەری سەرەوەی یەکەم جار دەرهات، ئەوا بەو منداڵە دەڵێن: سەرەخۆرەیە! لەشوێنێکی بەرزەوە فڕێی بدەنە خوارەوە.

- یاخود لە لادێیەکی سەر بەشاری هەولێر، دارێکی لێیە لەو لادێیەدا، خەڵکی دەستە دەستە بەتایبەتی لەهەولێرو چواردەوری دەچن بۆ لای ئەوداره، وە هەر کەسە کە گەیشتە لای ئەو دارە، بزمارێکی پیادا دەکوتێت، بەباوەڕی ئەوەی ئەگەر ئێستا ددانی ئازار بکات بەڵکو ئەو ئازارەی نەمێنێت، یاخود بەباوەڕی ئەوەی کە لە ژیانیدا تووشی ددان ئێشە نەبێت، ئیتر ئەو دارە داماوە هەر کەس پێی دەگات بزمارێکی پیادا دەکوێت،کە وەکو ژیژکی لێ هاتووە ئەوەندە بزماری پیاداکوتراوە، وە شوێنێکی نەماوە ئیللا بزمارێکی پیاکوتراوە.

نییه كه بتوانیٚ ئەو گیروگرفت و ناخۆشی و ناڕەحەتییەت لەسەر لابەرێت و وە لێتی دوور بخاتەوە، خۆ ئەگەریش پەروەردگار ویستی خێرو خۆشییەكت پیٚ ببەخشێت و بیهێنێتە ڕێت، ئەوا هیچ كەس و هێز وتوانا و دەسەلاٚتێك ناتوانیٚ ڕێگای ئەو خێرو خۆشییەت لیٚ بگرێت، بەڕاستی تەنها (الله) بەسەر هەموو شتێكدا بەتواناو بەدەستەلاٚتە[1].

## ٢٧- باوەڕبوون لەزاخ و ماسی سوێر خۆی كراودا: الاعتقادُ في الشَّبِة والفَسُوحة.

هەندیٚ خەڵكی هەموو بەیانییەك ماڵەكەی، یاخود دوكانەكەی بۆندارو بوخردار دەكا بەزاخ و ماسی سوێر خۆی كراو، وا گومان دەبا ئەم دوو شتە حەسودی لادەبەن.

وە هەندێكیان ئەو كەسەی كە حەسوودی پیٚ برابێت بەم دوو شتە بۆنداری دەكەن، پاشان زاخ و ماسییە سوێر خویٚ كراوەكە دەخەنە ناو ئاگرێكەوە و دەیان سووتێنن بەیەكەوە، وە پاشان سەیری ناو ئاگرەكە

---

[1] بیروباوەڕی هەڵە لەشت شكاندندا:-

- لای خەڵكانی ئێمە ئەگەر شتێك بە دەستیانەوە كەوتە خوارەوە و شكا، یان ئەو شتە لەشوێنێكەوە كەوتە خوارەوە و شكا، یەكسەر دەڵێن: قەیناكا، قەزاو بەلاٚی بردبێت.

- یاخود هەندێك لە خەڵكی خۆیان شتێكی ماڵەكەیان دەكێشن بەزەویداو دەیشكێنن، ودەڵێن: باشەڕو ئاژاوەی ماڵەكەمان لەگەڵ خۆیدا ببات!!.

- یان هەندێك باوەڕیان وایە ئەگەر شتێكیان شكا ئەوا ئەوشت شكانە ناگرسێتەوە، هەتا سیٚ شتیان بەدوای یەكدا نەشكێت تەواو نابێت ئەم شت شكاندنە.

دەکەن، بەبانگەشەو فریوی ئەوان کە ئەم دوو شتە کە توانانبەوەو سووتان لەناو ئاگرەکەدا دەچنە سەر شکڵ و شێوە و وێنەی ئەو کەسەی کە حەسوودییەکەی پێ بردوون. وە هەموو ئەمانە پڕوپووچی و ئەفسانەیە[1].

---

[1] لای خەڵکی میسر ئەم شێوازەیان گرتۆتەبەر بۆ لابردنی حەسوودی لە بەرووبوومی کێڵگەکانیاندا،بەڵام لای خەڵکی ئێمە وەکو ئەو شێوازەی میسرییەکان وایە بەڵام بەکاری دەهێنن بۆ دەرکردنی ترس، ئەویش بەم شێوەیە:

- ئەگەر منداڵێك تووشی ترس ببێ، پشکۆیەکی ئاگر دەهێنن لەگەڵ جامێك ئاوی سارد، ئەمجا لەسەر سەری منداڵەکە جامە ئاوەکە ڕادەگرن و وەبەمقاش پشکۆکە دەگرن و دەیخەنە ناو جامە ئاوە ساردەکەوە، هەتا پشکۆکە بەتەواوەتی دەکوژێتەوە لەناو جامە ئاوەکەدا، پاشان دەڵێن: ترساوە ئەم منداڵە!! وە مەبەستیان لەکردنی ئەم کارەدا ئەوەیە کە ئەو منداڵە ترسەکەی نەمێنێ و، وە نەخۆشییەکەی چاك ببێت بەئەنجامدانی ئەم کارە پڕوپووچەو بێ عەقڵانەیە.

- یاخود ئەگەر منداڵێك نەخۆش بکەوێت و وە ڕەنگی زەرد ببێت، پێی دەڵێن: ئەوە ترساوە!! بەری بۆ بگرن بەپیاز، کە بریتییە: لەوەی کە دێن سەلکێك پیاز دەهێنن، وە بەبەری دەست بەپیازەکەدا دەکێشن و دەیکەن بەدوولەتەوە، وە دەبێت بەقەچۆ دوولەتی نەکەی بەڵکو دەبێت بەدەست پیازەکە بپیشێنن، پاشان پیازەکە بەلەت کراوی هەڵ دەسوون لەدەست و قاچی منداڵەکە بەشێوەی ڕاست و چەپ، واتە: پیازەکە هەڵدەسوون لەبەری پێی ڕاستی منداڵەکەو وەبەری دەستی چەپی، ئەمجا لەبەری پێی چەپی بۆ بەری دەستی ڕاستی. وەپاش ئەوە هەڵی دەسوون لە ناوچاوان و سەری لووت و هەندێك جاریش لە کۆمی منداڵەیشی هەڵدەسوون، لەدواییدا ئەو دوو لەتە پیازە یان دەیخەنە پشتی وسەرینی منداڵەکەوە،وە یان فڕێی دەدەنە بەر پێی منداڵەکە ووە دەڵێن: باپیسی بەپیسیەوە بڕوات!! وە دەبێت ئەو منداڵە تا چەند سەعاتێکیش ماچ نەکرێ، چونکە بەری گیراوەبەپیاز(واتە سواخ دراوە بەپیان) وە ئەگەر ماچی بکەن ترسەکەی دەرناچێت.

## ٢٨- باوەڕبوون لەئەستێرەکاندا: الاعتقادُ في النّجوم

هەندێ لە خەڵکی ڕۆژانە پەڕەی ڕۆژنامەکان هەڵدەداتەوە و سەیری ڕۆژنامەکان دەکات، هەتاوەکو بەختی خۆی بخوێنێتەوە لەو ڕۆژەدا لەگۆشەی (تۆو ئەستێرەکاندا)، دێت حسابی ڕۆژی لەدایك بوونەکەی و بورجەکەی دەکا، پاشان سەیر دەکات تا بزانێ ئەستێرەناسەکە لەژێر ئەو بەروار و بورجەدا چی بۆ نوسییوە لە بەختەکەی ئەمڕۆیدا.

کە هەموو ئەمانەش شەریك بۆ خوا دانانەووە دروست نییە، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ: (مَن أتَى عَرّافاً أو كاهِناً، فَصَدَّقَهُ بِما يقولُ، فقد كَفَرَ بِما أُنزِلَ على محمد)[1].

واتە: هەر کەسێك بچێت بۆ لای جادووگەرێك یاخود فاڵچییەك، وە بڕوا بکات و بەڕاستی دابنێ ئەو قسانەی کە ئەو جادووگەرە دەیانڵێت: ئەوا ئەو کەسە کافرو بێ باوەڕ بووە بەو قورئانەی کە بۆ محمد هاتۆتە خوارەوە.

---

- یاخود بەشێوەیەکی تر ترسی منداڵ دەردەکەن، کە ئەوەیە: دایك و باوکی منداڵە ترساوەکە دێن پارچەیەك قورقوشم دەتوێننەوە و، ئەمجا جامێك ئاو دەهێنن و لەسەر سەری منداڵەکەیان ڕایدەگرن، پاشان قورقوشمە تواوەکە دەکەنە ناو جامە ئاوەکەوە، وە دوایی ئەو قورقوڕشمە تواوە کە لەناو ئاوەکەدا چووە سەر شێوەی چ شتێك دەڵێن: ئەوەتا لەوە ترساوە!! ئەگەر لەدوو پشکە بچێت شێوەی قورقوشمەکە دەڵێن: لە دووپشك ترساوە،وە ئەگەر لە تەیارە بچێت دەڵێن: لەتەیارە ترساوە، وە ئەگەر لەمرۆڤ بچێت دەڵێن: لە خەڵکی ترساوە و.... هەتا دوایی، وە دەبێت لەکاتی ئەوەدا کە قورقوشمەکە دەکەنە ناو ئاوەکەوە بڵێن: سەگەکە بەشەو هاتی بەڕۆژ بڕۆ، بەڕۆژ هاتی بەشەو بڕۆ، بەڵکو منداڵەکەیان ترسەکەی دەرچێت.... دەك خوارەحم بەبێ عەقڵیتان بکات.

[1] حديثٌ صحيح: رواه احمد والحاكم وصححه الالباني لە (صحيح الجامع) دا بەژمارە (٥٩٣٩).

وە خـــوای گـــەورەش دەفـــەرموێ: ﴿قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلْغَيْبَ إِلَّا ٱللَّهُ﴾ (النمل: ٦٥).

واتە: ئەی پێغەمبەر! بەهەموو خەڵکی ڕابگەیەنە و پێیان بڵێ: کە هیچ کەسێك لە ئاسمانەکان و زەوییدا غەیب و نهێنییەکان نازانێ جگە لە (الله) نەبێ.

## ٢٩- ڕەشبینی کردن لە پێکەنینی زۆردا: التشاؤمُ في كثرةِ الضحك

بەڕاستی هەندێ لەخەڵکی باوەڕییان وایە کە پێکەنینی زۆر هەر دەبێ غەمناکی و پەژارەو خەفەتی بەدوادا بێت، خۆ ئەگەر هاتوو زۆر پێکەنی یەکسەر دەڵێ: (اللّهم اجعله خيراً) واتە: خوایە بەخێری بگێڕی.

وە ئـــەم بۆچـــوونەش بیروبـــاوەڕێکی بـــاطیـــل و پـــووچ و ناڕاســـتە. بەڵێ، هەرچەندە پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەو نەهی کردووە لە پێکەنینی زۆر، ئەویش لەو فەرموودەدا کە (ابن ماجە) گێڕاویەتیەوە و، وە شێخ ئەلبانیش لە صەحیحەکەیدا فەرموودەکەی بە صەحیح داناوە لە (ابوهريرە)وە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (لاتُكثـر الـضحكَ، فإنَّ كَثرةَ الضحِكِ تُميتُ القلبَ)[1]، واتە: زۆر پێ مەکەنە، چونکە پێکەنینی زۆر دڵ دەمرێنێ.

بەڵام ئەوە بزانە پێکەنینی زۆر هیچ پەیوەندییەکی بەخێرو شەڕو غەم و پەژارەوە نییە بەهیچ شێوەیەك[2].

---

[1] حدیثٌ صحیح: رواه ابن ماجه و صححه الالباني له (السلسلة الصحيحة)دا بەژمارە (٥٠٥)، وە لە (صحيح الجامع) دا بەژمارە (٤٧٣٥).

[2] ڕەش بینی کردن لەپێکەنیندا:

## ٣٠-ڕەش بینی کردن لەدەنگی "کونە پەپوودا" یاخود" قەلەڕەشدا" یاخود "سوورەداڵدا"[(١)]؛

هەندێ لەخەڵکی ئەگەر گوێی لەدەنگی کونە پەپوو بوو، دەڵێ: خێر بێت!! ئەبێ ئەمڕۆ کێ بمرێ؟ ئەبێ ئەمڕۆ چی ڕووبدات؟

ئەمجا هەر پێنج سونەنەکە فەرموودەیەکیان گێڕاوەتەوە، وە شێخ ئەلبانیش -خوا لێی خۆش بێت- بەصەحیحی داناوە لە (صحیح الجامع)دا بەژمارە (٣٩٦٠) لە (ابن مسعود)ەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (الطيرةُ شِركٌ)، واتە: ڕەش بینی کردن لەباڵندەدا شەریک بۆ خوا دانانە[(٢)].

---

- لای ئێمە کە لە ماڵێکدا کۆمەڵێك خەڵك بەیەکەوە دادەنیشن و دەست دەکەن بەقسەی خۆش، کە زۆر پێکەنین، یەکسەر یەکێکیان بەتایبەتی یەکێك لەئافرەتان دەڵێت: یاخوا خێر بێت، ئێمە پێکەنینمان پێوەنایەت، تووشی بەڵایەك نەبین.
- یاخود ئەگەر منداڵێك زۆر پێ بکەنیت،ئەوا بەو منداڵە دەڵێن: خوا ڕەحممان پێ بکات، بەخوا ئەم پێکەنینەی تۆ شتێکی بەدەمەوەیە.

(١) الحَدَأة : بریتییە لە داڵێکی سوور، کە خواردنی لەسەر مشك و کەروێشك و ئەم بابەتانەیە، کە نموونەی لەسەر تیژ ڕەوی لەسەر دەهێنرێتەوە.

(٢) جۆرەکانی ڕەش بینی لای خەڵکانی ئێمە:

- قەلەڕەش بەسەر هەر ماڵێکدا بڕوات و بقیڕێنێ ئەوا ئەو ماڵە مردوویان لێ دەمرێت، یان بەسەر هەر شارو لادێیەکدا بڕوات ئەوا چۆڵی دەکەن.
- ئەگەر گوێدرێژ لەناوەختدا بزەڕێنێت ئەوا شەیتان دەبینێ و خراپە، یاخود دەڵێن: ئەوا ئەو گوێدرێژە گورگ بانگ دەکات.
- ئەگەر هەر حەیوانێك ئیتر مەڕ بێت یان مانگا، ئەگەر لەشەودا بباڕێنێت یان ببۆڕێنێت، ئەوا دەیانگوت: سەری ساحەبەکەی دەخوات و دەبێت سەری بڕن.

**٢١- ڕەش بینی لەکەسێکدا لەکاتی چوونە ژوورەوەیدا بۆ ماڵێک کارەبا ببڕێ:**
ئەوا بەو کەسە دەڵێن: ئەی چەند کەسێکی شومە!!، یاخود پێی ئەڵێن: وەیش خومرە ناهێڵی لەماڵدا (واتە: ووشکی دەخاتە ماڵ)، وە ئەم ڕەش بینییەش دروست نییە، لەبەرئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لەو فەرمووەدا کە ئیمامی (موسلیم) گێڕاویەتیەوە فەرموویەتی: (لاطَيْـرَةَ) ، واتە: ڕەش بینی مەکەن.

---

– ئەگەر کەسێك بچوایە بۆ سەرکێڵگەکەی یان بۆ سەفەر یان بۆ هەر ئیشێکی تر، ئەگەر ڕێوییەکی تووش ببوایە ئەوا ئەوکەسە زۆر خۆشحاڵ دەبوو، بەڵام ئەگەر کەروێشکێکی ببینیایە دەگەڕایەوە و دەیووت: کەروێشك شوم و نەگبەتییە!!.
– کەڵەشێر لەشەودا یان لەناوەختدا ئەگەر خوێندی دەڵێن: یاخوا خێر بێت!! دەبێت سەری بڕی و سەرەکەی هەڵبدەی بۆ پشت ماڵەکەت، ئەگین وانەکەی ئەوا تووشی شەڕو نەگبەتییەك دەبێت، یان مردووەیەکمان لێ دەمرێت، یان باوکمان دەمرێت.
– مەنجەڵی ڕەش بەشەودا نابێ بیبەیتەوە بۆ ماڵی خاوەنەکەی، چونکە خراپە! ئەو ماڵە مردوویان لێ دەمرێت.
– ئەگەر هەر کارێك بەهیوا بووی بیکەی، وە لەو کاتەدا باسی ئەو کارەت دەکردو پژمیت، ئەوا سەبر بکە ئەو کارەمەکە و دوای بخە ئەگین خراپە بیکەی.
– ترخێنە نەکرێت لەماڵدا باشە، چونکە مردووت لێ دەمرێت.
– گوڵە نازناز لەماڵدا نەچێنی،چونکە خراپە بۆ ئاژاوەی ماڵ.
– سێ شەممان خراپە سەرېتاشی، بیخە ڕۆژێکی تر.
– لەشەودا تەگبیر مەکەن، چونکە تەگبیری شەو بەتاڵەو سەر ناگرێت.
– ئەگەر یەکێك ڕابکشێ یاخود بخەوێت، دەڵێن: هەنگاوی بەسەردا مەهێنە، چونکە تەمەنی کورت دەبێت.
...دەی باشە خەڵکینە! ئەگەر بەقسەی ئێوە بکەین، مەگەر هەر زوو قەبرێك بۆ خۆمان هەڵ بکەنین و بەزیندوویی تێی بچین، ئا ئەمە لەوە باشترە ئەم هەموو بیروباوەڕە پووچەڵە لەژیانماندا پەیڕەوی پێ بکەین.

### ٣٢- خۆ پێ چانەوە و کۆڵ بەکۆڵدادان بۆ جگە لەو سێ مزگەوتە پیرۆزە؛

وەکو کەسێك کە کردوویەتی بەپیشەی کە دەبێ نوێژی هەینی ببات بۆ مزگەوتێك کە قەبری تێدایە، وەکو ئەو مزگەوتەی کە قەبرەکەی (بەدەوی) تێدایە، یان ئەو مزگەوتەی کە قەبری (دسوقی) تێدایە.

وە هەر کەسێك سەفەر یاخود خۆی شەتەك و بپێچێتەوە، یاخود خۆی بەتایبەت ئامادە بکات بۆ مزگەوتی "ئیبراهیم دسوقی" بەگومانی ئەوەی کە نوێژکردن لەو مزگەوتەدا باشترەو پیرۆزترە لە نوێژی مزگەوتێکی تر، ئەوا پێغەمبەر (ﷺ) نەهی و قەدەغەی کردووە لەو کارە، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەی کە هاتووە لە صەحیحی "بوخاری و موسلیم" دا لە (ابی سعید)ەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (لا تُشدُّ الرِّحالَ اِلاّ الی ثلاثةِ مساجِدَ: المسجد الحرام، و مسجدِي، والمسجدِ الاقْصَى[1]).

واتە: کۆڵ بەکۆڵدا نادرێت و سەفەر و خۆگورج ناکرێتەوە بۆ هیچ شوێنێك لەبەر پیرۆزی، تەنها بۆ سێ مزگەوت نەبێت: بۆ مزگەوتی حەرام (کعبة)، وە بۆ مزگەوتەکەی من (مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) )، وە بۆ مزگەوتی ئەقصا (قودس).

### ٣٣- چەمینەوە بۆ جگە لە خوا: الرکوعُ لغیرِ الله

رکوع: بریتییە لەو چەمینەوەی کەدەبرێت بۆمەبەستی بەگەورە زانین، وە ئەم رکوع و خۆچەماندنەوە دروست نییە بەکاربهێنرێ جگە لە بۆ خوای گەورە نەبێ، کەوابوو دروست نییە بۆ فەرمانبەرێ کە خۆی بچەمێنێتەوە، وە یاخود خۆی کوڕ بکاتەوە بۆ بەڕێوەبەرەکەی کە لەکاتێکدا کە سڵاوی لێ دەکات، وە بەهەمان شێوە دروست نییە ئەو

---

[1] حدیث صحیح: رواه البخاري بەژمارە (١١٨٩) و مسلم بە ژمارە (٨٢٧).

چەمینانەوەی کە دەبرێت لەلایەن وەرزشەوانی کاراتی و کۆنگ فۆوە، وە هەروەها هەر جۆرە چەمینەوەیەکی تر کە دەیبات بۆ ڕاهێنەرەکەی.
وە هەروەها بەهەمان شێوەش دروست نییە ئەو شێوە چەمانەوەی کە گۆرانی بێژ دەیبات بۆ جەماوەرەکەی، لەکاتێکدا کە جەماوەرەکەی بەگۆرانییەکەی سەرسام دەبن و بەدڵیان دەبێت... وە هەموو شێوازێ لەم چەمینانەوە دروست نییە[1]

**٣٤-دەست پێش خەری ئەهلی کیتاب لەسەلام کردندا: بدء اهل الكتاب بالسّلام.**

ئیمامی موسلیم لە صەحیحەکەیدا فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە لە (ابوهریره)وە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (لا تبدءوا اليهود والنصارى بالسّلام).

واتە: دەست پێش خەری کەسانی جوولەکە و گاور مەکە لەسلاوکردن لێیان.

**٣٥- قسە وتن و جنێودان بەهاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ): سبُّ الصحابة**

بەڕاستی هەندێ لە خەڵکی زمان درێژی و سەرکێشی دەکەن لەوەدا کە جنێو بەهاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) دەدەن، وە ئەم جنێودانە تانەدان و بوغزاندن و سوکایەتی کردن و شێواندن و قسە وتنە بەبیروباوەڕی دینی ئیسلام. لەبەرئەوەی خوای پەروەردگار هەڵنابژێری بۆ هاوڕێیەتی کردنی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئیللا خەیرترین و باشترینی مرۆڤەکان نەبێت،ئەمەیش بەڵگەی ئەو فەرموودەی کە هاتووە لە صەحیحی (بوخاری و موسلیم) دا کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (خَيرُ أمّتي

---

[1] بێگومان دەست خستنە سەر سنگ بەمەبەستی ڕێز لێنانی کەسێك جۆرێك لە خۆچەمینەوەی تیادا دروست دەبێت کە ئیسلام پێی ڕازی نییە.

قَرني، ثمَّ الذين يَلُونَهُم.....[1] )، واتە: خەیرترین و باشترینی خەڵکی ئوممەتەکەم خەڵکی ئەم سەردەمەی منە، پاشان ئەوانەی کە بەدوا ئەمانەدا دێن.

وە دووبارە هاتووە لەهەردوو صەحیحەکەدا کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (لا تَسُبُّوا أصحابی، فوالذی نَفسی بِيَدِه لَوْ أنَّ احدَكُم انفقَ مِثلَ أُحُدٍ ذَهَباً مابَلَغَ مُدَّ احدِهِم، ولانَصِيفِهِ)[2].

واتە: جنێو مەدەن بەهاوڕێکانم، سوێند بەو زاتەی کە نەفسی منی بەدەستە، ئەگەر یەکێ لەئێوە ببەخشێ لەپێناوی خوادا ئاڵتون بەوێنەی شاخی ئوحود، هێشتا ناگاتە مشتێ خێری دەستی یەکێ لەوان (هاوەڵان)، وە نەبە نیوە مشتە خێرێکی دەستیان.

## ٣٦- بەکافرکردنی موسوڵمانان بەبێ بەڵگە : تكفيرُ المسلم بغير حُجة

لەناو خەڵکیدا کەسانێکی وا هەیە پەلە دەکات لە کافرکردنی موسوڵماناندا بەبێ هیچ بەڵگەو سەلماندنێ. وە ئەمەش دروست نییە، خۆ ئەگەر کەسێك لێی هەڵەببێ و حوکم بدات بەسەر کافرێکدا بەوەی کە پێی بڵێت موسوڵمانە، ئەمە خەیرترو باشترە لەوەی کە بە هەڵە حوکم بدات بەسەر موسڵمانێکدا بەکافرییەت،جونکە لەهەردوو صەحیحەکەدا فەرموودەیەك هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (مَن قالَ لأخِيه: ياكافرُ. فَقَدْ باءَ بها أحدُهما)، واتە: هەر کەسێك بەبرا موسوڵمانانەکەی بڵێ: ئەی کافر! ئەوا ئەو بەکافرکردنە بەر یەکێك لەو دووکەسە دەکەوێت.

وە لە ڕیوایەتێکی تردا فەرموویەتی: (فإنْ كان كما قالَ، وإلاّ حَارَتْ عليه)[1]، واتە: خۆ ئەگەر هاتوو ئەو کەسەی کە کافر دەکرێت وانە بوو،

---

[1] حديثٌ صحيح: رواه البخاري، بەژمارە (٣٦٥٠)، و مسلم بەژمارە (٢٥٣٥).

[2] حديثٌ صحيح: رواه البخاري، بەژمارە (٣٦٧٣)، و مسلم بەژمارە (٢٥٤١).

[1] حديثٌ صحيح: رواه البخاري (١٠/٥١٤)، و مسلم (٢/٤٩).

ئەوا ئەو کافر کردنە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسە خۆی کە ئەو بەکافر کردنەی وتووە[1].

**٢٧- کردنی جوولەکە و گاور بە دۆست و وە ڕاوێژییان پێ بکات کەسێك لە کارەکانیدا:**

دروست نییە بۆ هیچ موسڵمانێك کە کەسانێکی جوولەکەو گاور، یاخود بێ باوەڕ بکات بەهاوڕێیەکی دەست پاك و باوەڕپێکراو بۆ خۆی، وە ڕاوێژیان پێ بکات لەکارەکانیدا.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡ﴾ (المائـدة: ٥١)، واتە: ئەی گرۆی باوەڕداران: ئێوە جوولەکەو گاور مەکەن بەخۆشەویست و دۆست و پشت پێ بەستووی خۆتان، وە مەیان کەن بەیارمەتیدەرو پەیمانیان لەگەڵدا مەبەستن دژی موسڵمانان، وە نهێنی خۆتانیان لا مەدرکێنن، چونکە ئەوان دڵسۆزی ئێوە نین، وە هەر کۆمەڵێك لەوان کۆمەکی کەرو لایەنگرو پشت و پەنای ئەوانی تریان و خۆیانن، وە هەر کەسێك لەئێوە یارمەتیان بداو هاریکارییان بکات، یاخود پشتیان پێ ببەستێ، یاخود داوای یارمەتییان لێ بکات، ئەوا ئەو

---

[1] لەسەر ئەم بەکافرکردنە خوویەکی خراپ هەیە لای ئێمە، ئەویش ئەوەیە:-

- ئەگەر کەسێك لە کەسێکی تر تووڕە ببێت، پێی دەڵێت: تۆ سەیری ئەم کافری مەلعونە ناکەی.

- یان ئەگەر کەسێك قسەی بۆ کەسێکی تر کرد و باوەڕی پێ نەکرد، ئەم بەو دەڵێت: ئاخر کافر بۆ باوەڕم پێ ناکەیت، یاخود تۆ کافرو بێ زەمیری، یان پێی دەڵێت: بێ دینی بێ ئیمان.

کەسە لەوانەو وە لەکۆمەڵی ئەوان حسابی بۆ دەکرێت،ووە وەکو ئەوان وایەو،وە لەکۆمەڵی موسوڵمانان نییە.

وە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿لاتَتَّخذُوا بطانَةً مِنْ دَونكـم﴾، واتـە: ئەی ئەوانەی کە ئیمانتان هێناوە و موسوڵمان بوون، لەخۆتانی موسوڵمان زیاتر، کەسانێکی دیکە بەدۆست و برادەرو یاوەری خۆتان مەزانن، وە هەرگیز دوژمنانتان بەسەر نهێنی خۆتاندا ئاگادار مەکەن،وەدۆستایەتی لەگـەڵ خوانەناسـاندا مەکەن،چـونکە ﴿لَا يَأْلُونَكُمْ خَبَالاً﴾ ئـەوان کەمتەرخـەمی ناکـەن لـەزیان پێگەیاندنتان،وە ئەوەنـدەی بتـوانن هـەوڵ دەدەن کاروبارتان بشێوێنن ﴿ وَدُّوا مَا عَنِتُّمْ ﴾ وە ئاواتەخوازی ئەوەن کـە ئێـوە تووشـی ئـەو پـەڕی زەرەرو زیـان بـبن لـەدین و دونیـادا، وە هەمیـشە لەزەحمـەت و ئـازارو ناڕەحەتیـدا بـن، ﴿قَدْ بَدَتِ ٱلْبَغْضَآءُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ﴾ وەڕق و کینـەیان بەرامبـەر بـە ئێـوە ئەوەنـدە زۆرە کـە ناتوانن لەناخییاندا بیشارنەوە، بەدەم ئاشکرای دەکەن.

﴿وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ﴾ (ال عمـــران :١١٨)، وە ئـــەو ڕق و کینەیەی کە لـەدڵ و سینەیاندا شـاردویانەتەوە زۆر گـەورەترە لـەو ڕق و قین و ناخۆشەویستییەی کە هەیانە لەبەرامبەرتان ووە بەدەم ئاشکرایان کردووە.

## ٣٨- ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی هەڵمژین و هەڵ کردنی شنە با: الاحتفالُ بشم النَّسيم .

نەریتێکە بـت پەرسـتە فرعەونییـەکان (میـصرییە کۆنـەکان) دروسـتیان کردووە، وە ناویان لێ نابوو: (يومُ الزِّينةِ)، واتە: ڕۆژی خۆ ڕازاندنەوە.

وە ببـووە نـەریتی یۆنانییـە کۆنـەکانیش کـە ئاهـەنگیان بـەو بۆنەیـەوە دەگێڕا، بەباوەڕی ئەوەی کە زەوی کچێکی هەیە،کە ئەو کچەی خانمە ووە هـەموو کارەکـانی زەوی بـەڕێوە دەبـات و سەرپەرشـتی دەکـات، وە

زەوی زویرو خەفەتبارو دڵشکاو بووە، لەبەرئەوەی خوای جیهانی خواروو کچەکەی زەوی فڕاندووە، وە کاتێ کە زەوی دڵگران و خەفەتبار بوو، دوای ئەوە ووشك و بێ باران و بێ پیتیش بوو، وە ڕووەك و بەروبوومیشی لەمرۆڤ قەدەغەکرد، لەئەنجامدا مرۆڤەکان هۆمەن و هاواریان برد بۆ لای خوایەك کەناوی خوای (ئەولەمپ[1]) بوو، لەئەنجامدا فەرمانیان دا بەسەر خوای جیهانی خوارووداا کەوا ئەو کچەی زەوی لەهەموو ساڵێکدا شەش مانگ بیگێڕێتەوە بۆ زەوی دایکی، وە دیاریان کرد کە کاتی گەڕانەوەی ئەو کچەی زەوی لەوەرزی بەهاردا بێت، وە کاتێك کە زەوی لەبەهاراندا سەوز دەبێ، لەبەر خۆشی دەربڕینییەتی بەگەڕانەوەی کچەکەی، وە خەڵکیش بەو بۆنەیەوە ئاهەنگ دەگێڕن، وە ناویان لێناوە: (عیدُ الربیع)، واتە: جەژنی بەهار، یاخود (النیروز)، واتە: جەژنی نەورۆز، یاخود (شمُّ النسیم)، واتە: ڕۆژی بۆن کردنی شنەبا، وە دڵخۆشن خەڵکی بەسەوز بوونی زەوی، ئەویش لەبەر خۆشی دەربڕینی زەوییە بەگەڕانەوەی ئەو کچە (بەدرۆ هەڵبەستراوە)یە بۆی.

وە ئا ئەمانە هەر هەمووی یەکێکن لە ئەفسانەو پڕوپووچی کافرە بت پەرستە یۆنانی و میصرییە کۆنەکان.[2]

---

[1] ئەولەمپ: ناوی شاخێکی بەرزە لە یۆنان کە بەرزییەکەی ٢,٩١٧م، وە ناوی شارێکی کۆنیشە هەر لەیۆنان، وە لەو شارەدا بتێکیان هەبوو بەناوی ئەو شارەوە ناویان لێ نابوو: (خوای ئەولومپ)، وە ئەم شارە مەکەزو مقەڕی پەرستنی ئەم بتە بووە لای یۆنانییەکان، وە یاری ئەولومپی کە ساڵانە دەکرێت بەخۆشەویستی ئەو بتەوە ناونراوە، وە زوو لەکۆندا کراوە، وە ئێستا هەر بەردەوامە.

[2] بگەڕێوە بۆ پەرتووکی (أقوال وافعال خاطئة)ی د. طلعت زهران، لاپەڕە (٥٠).

کەوا بوو ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی هەڵمژین و بۆن کردنی شنەبای بەهار خۆ شوبهاندنە بەکافرەکانەوە، وە پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێت: (لَيسَ مِنَّا مَنْ تَشَبَّهَ بغيرنا)[1]، واتە: لەئێمە نییە هەر کەسێ کە خۆی بشوبهێنێ بە جگە لەئێمەوە.

وە لەلای (ابی داود) فەرموودەیەکی تر هاتووە و شێخ ئەلبانی لە (الإرواء) بەصەحیحی داناوە بەژمارە (١٢٦٩)، لەو فەرموودەیەدا کە (ابن عمر) گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مَنْ تَشَبَّه بقومٍ فهو منهم[2])[3]، واتە: هەر کەسێ خۆی شوبهاند بە هەر گەل و کۆمەڵێکەوە ئەوا ئەو کەسە لەوانە[4].

---

[1] حديثٌ صحيح: حسنه الالباني له (الصحيحة)دا بەژمارە (٢١٩٤).

[2] حديثٌ صحيح: رواه ابو داود، وصححه الالباني، لە "الارواء"دا،بە ژمارە (١٢٦٩).

[3] بۆزیاتر شارەزا بوون بگەڕێوە بۆ پەرتوکی (حكم الاسلام في الاحتفال بشم النسيم)ی نووسەر.

[4] جەژنی هەڵمژینی شنە بای بەهار (نەورۆز):

- ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە کە شەیتانی نەفرین لێکراو، بۆ هەموو سەردەم و ساتە وەختێك، و وە بۆ هەموو گەل و هۆزێك، وە بۆ هەموو نەوەیەك یەك لەدوای یەك، وە بۆ هەموو تەك تاکێکی ئەم مرۆڤە بەپێست ڕەش و سوورو زەردو سپییەوە، بۆ هەموویان نەخشەی تایبەتی و فێڵ و تەڵەکەو فریوی خۆی بۆ داناون، بەشێوەیەك کە بتوانێت ئەوەی کە خۆی دەیەوێت ئەنجامی بدات، ئەویش لادانی ئەم بنی ئادەمەیە لەڕێگەی خوای ربولعالمین.

جارێك بتییان بۆ دروست دەکات، جاری نەتەوە پەرستییان بۆ دادەنێت، جارێکی تر بەدڕەوشتی، پاشان فریوییان دەدات بۆ دروست کردنی جەژنی پڕوپووچ و شیرکییات، کە یەکێك لەو جەژنە درۆیانە ئەم جەژنەیە، لای گەلێك شەیتان ناوی بێ

## ٣٩- ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی جەژنی دایکەوە: الاحتفالُ بعيد الأم

ئەم ئاهەنگە ڕۆژئاوای کافر دایهێناوە ودروستی کردووە، لەبەرئەوەی خەڵکی لای ئەوان ڕێ بڕانی و سەردان لەگەڵ دایکیسدا دادەبڕێ، و بەچەندەها ساڵانی دوورو درێژ ئەو کەسە دایکی نابینێ، وە نەدەچێت بۆلایشی هەتاوەکو سیلەی ڕەحمی لەگەڵدا بەجێ بهێنێ.

لەبەرئەوە دایان ناوە بۆ دایک ( یەك ) ڕۆژ لە ساڵێکدا، لەو ڕۆژەدا سەردانی دایکیانی تیادا دەکەن و، وە دیارییان پێشکەش دەکەن، پاشان لەدوای ئەو ڕۆژەوە ئیتر پەیوەندی لەگەڵ دایکیاندا دەپچڕن لەتێکڕای ساڵەکەدا، بەڵام ئیسلامی پیرۆز هانی خەڵکانی داوە لەسەر جێبەجێ کردنی سیلەی ڕەحم و چاکەکردن لەگەڵ دایکاندا بەدرێژایی

---

ناون: جەژنی هەڵمژینی شنەبای بەهار، لای گەلێکی تر: با جەژنی دارودرەخت بێت، لای یەکێکی تر: بڕانەوەی زستان و هاتنی بەهار، بۆ گەلێکی تر: سەرکەوتنی هێزی خێر بەسەر هێزی شەڕ و سەرمادا، وەبۆ گەلی ئێمەش جەژنی نەورۆز، خوا جەژنی وابە هیچ گەلێك نەدات، ئەگەر لای ئەوان شنە ی با هەڵمژن، لای ئێمە ئەوەندە تایەی تیادا دەسوتێنرا ڕۆژی ڕووناکمان لێ دەکرا بە هەورو هەلا، لای ئێمە بۆنی شنەبا دەبێت بەبۆنی شنە بای تایە سووتاو، تا زەمانێکیش ئەم تایە سووتانە شەیتان هانی خەڵکی دەدا کە سوور بن لەسەر ئەنجامدانی، چونکە سەلماندنی بوونی نەتەوەکەیانە.

بێگومان ئەم (نەورۆزە)ش هەر جلە کۆن و دڕاوەکەی یۆنانی و میسرییە کۆنەکانە، شەیتان دڕاوییەکانی دووریوەتەوە و کردوویەتی بە بەری گەلی کوردی داماودا. بەڵام سوپاس بۆ خوا ساڵ بەساڵ خەڵکی تۆزی عاقڵ بوون لەتایە سووتانەوە کردوویانە بەدار سووتاندن، بەڵکو سەردەمێك بێت ئەم نەریتە پیسە هەر لابرێت و وە هەر کەسێك ئەنجامی بدات بەبێ عەقڵ سەیری ئەو کەسە بکەن.

ساڵ، وه ڕاخستنی باڵی میهرەبانی و سۆز بۆیان، وه سزا نەدان و فەرامۆش نەکردنیان و وەڕێ برانی دانەخستن لێیان .
کەوا بوو ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی جەژنی دایکەوه خۆ شوبهاندنه بەکافرانەوه.

## ٤٠- ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی جەژنی لەدایك بوونەوه: الاحتفالُ بعيد الميلاد .

لەناو خەڵکیدا کەسانێکی وا هەیه هەموو ساڵێك ئاهەنگ دەگێڕێت بەبۆنەی جەژنی لەدایك بوونییەوه،بۆئەم مەبەستە دۆست و هاوڕێکانی کۆدەکاتەوەو، وه ئەو شەوه تا درەنگ ئاهەنگ دەگێڕن، وه شیرینی جۆراوجۆر دەخۆن بەتایبەت کێکی نەخشێنراو.
کە بێگومان ئەم ئاهەنگەش دووباره بیدعەیه و خۆشوبهاندنه به کافرانەوه[1].

---

[1] ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی جەژنی لەدایك بوونەوه لای خەڵکی ئێمە:
- کە ساڵێك تێ دەپەڕێت بەسەر لەدایك بوونی ئەو منداڵەدا، خاوەنی ئەو منداڵە لە ماڵی خۆیاندا، کۆمەڵێك لە کەسوکاریان بانگ دەکەن و وه کێك و شیرینی ئامادە دەکەن و ناوی لێ دەنێن :(عيدُ الميلاد).
ئەمجا ئەو منداڵە بەجوانترین شێوه دەڕازێننەوه، وه هەموو ساڵێك ئەم ئاهەنگەی لەدوای تەواوکردنی هەر ساڵێك لەتەمەنی بۆ دەکەن، وه لەسەر ئەو کێکەی کە ئامادەیان کردووه بەگوێرەی ژمارەی ساڵەکانی تەمەنی مۆمی بۆ دادەگیرسێنن، ئەمجا کە دەستیان کرد بەئاهەنگەکە ئەو منداڵە دەبێت فوو لەو مۆمانە بکات، بەواتای ئەوەی کە ئەوەندە مۆمی تەمەنی کوژاندۆتەوه، ئەمجا بەدەوریدا گۆرانی (هەپی پای تای تو یوو)ی بۆ دەڵێن.

**٤١- ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی حەوتەمین ڕۆژی لەدایك بوونەوە: الاحتفال بسبوع المولود .**

وە هەروەها لەناو خەڵکیدا کەسانێکی وا هەیە ئاهەنگ دەگێڕێ بەبۆنەی تێپەڕبوونی حەوت ڕۆژ بەسەر لەدایك بوونی منداڵەکەیدا، وە شیرینی بەسەر دراوسێکانیدا دەبەخشێتەوە. وە لەناویاندا کەسانێکی وا هەیە لەحەوتەم ڕۆژدا منداڵەکەی دەخاتە ناو بێژنێکەوە و ڕای دەوەشێنێ و دەڵێت: (بەگوێی قسەی دایکت بکە، و گوێ بۆ قسەی باوکت مەگرە).

وە کەسانێکی وایان هەیە دەسکەوانێك یان دەسووە دۆڵێك دەگرێت بەدەستیەوە لەو ڕۆژەدا، وە دەیکێشێت بەیەکدا ووە دەنگێکی لێ دروست دەبێ وەکو دەنگی زەنگی کەنیسە وایە، یاخود وێنەی ئەم شتە پڕوپووچانە ئەنجام دەدەن لەم ڕۆژەدا.

بەڵام لەئیسلامدا سوننەت وایە عەقیقەی[1] بۆ بکرێت بۆ ئەو منداڵە لە

---

[1] **عەقیقە**: بریتییە لەوەی کە هەر کەسێك خوا منداڵی پێ بەخشین ئیتر ئەو منداڵە کوڕ بێت یا کچ، دەبێت خاوەنی ئەوە منداڵە لەحەوتەمین ڕۆژی لەدایك بوونیدا حەیوانی بۆ سەر ببڕێت و وەسەری بۆ بتاشن و وە ناوی لێ بنێن.

**پرسیار: ئایا سوودی عەقیقە چییە؟ وەبۆچی دەبێت هەموو منداڵێك عەقیقەی بۆ بکرێت.؟**

وەڵام: لەفەرموودەیەکی صەحیح دا هاتووە لای ( ئیمامی ئەحمەد)بەژمارە(٧/١-٨)وەلە(ابوداود)دابەژمارە(٢٨٣٨/٣)وەلە(ترمزی)دابەژمارە(١٠١/٤ /١٥٢٢)وەلە(نەسائی)دابەژمارە(١٦٦/٨ /٤٢٢٠)وە(ابن ماجە)دابەژمارە ( ٢/١٠٥٦/٣١٦٥)وەلە(الارواء)دابەژمارە(١١٦٥)وەلەصەحیحی(ابن ماجە)ی شێخ ئەلبانیدا بەژمارە(٢٥٦٣)هاتووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووێەتی: (کُلُّ غُلامٍ

حەوتەمین ڕۆژی لە دایکبونیدا، کە بریتییە لەسەر برینی مەڕێك بۆ کچێك وە دوو مەڕ بۆ کوڕێك[1]، وە گۆشتەکەی دەبەخشرێتەوە بەسەر

---

رَهِيْنٌ بِعَقِيقتِهِ، يذبحُ عَنهُ يومُ سابِعِه، ويُسمى فيه، ويُحلَقُ رَأسُهُ)، واتە: هەموو منداڵێك کە لەدایك دەبێت بارمتەو گل دراوە وڕەهن کراوە بەو عەقیقەوە هەتا بۆی دەکرێت، لەڕۆژی حەوتەمدا حەیوانی بۆسەر دەبڕێت و ناوی لێ دەنرێت و سەری دەتاشرێت.
تێبینی بکە: لەفەرموودەکەدا ووشەی (رَهين) هاتووە وە لەڕیوایەتێکی تردا بە (مُرتَهِنٌ) ئەم ووشەیە هاتووە، کە ووشەی (رَهِينٌ) واتە: بارمتەکراو، وە ووشەی (مرتهنٌ) واتە: بەبارمتە دانراو، پاشان مانای هەردوو ووشەکە ئائەمە دەگرێتەوە: کە پێویستە و وە سوننەتە لەسەر خاوەنی ئەو منداڵەی کە لەدایك بووە، دەبێت گوێزە بانە (عقیقة) بۆ منداڵەکەی بکات و دوای نەخات، چونکە وەك بڵێی: ئەو منداڵە کە لەدایك دەبێت خراوەتە بارمتەوە، وەبە بارمتە دادەنرێت و وەگل دەدرێتەوە لای کەسێك لەجێگە ولەجیاتی قەرزێکدا، وە ئەو منداڵە لەو بارمتەییە دەرباز و ڕزگاری نابێت ئیللا بەوە نەبێت دەبێت عەقیقەی بۆ بکەیت، وە هەروەها ئەگەر ئەو عەقیقەی بۆ نەکرێت وەکو وایە: ئەو منداڵە بێ کەڵك دەبێت بۆ خاوەنەکەی و وە هیچ سوودێکی بۆیان نابێت، هەتا خاوەنەکەی ئەو قەرزە دەداتەوە کە عەقیقە بۆ کردنەکەیتی، وە ئەمجا ئەو منداڵە لەژێر ئەو بارمتەییەدا ئەو عەقیقە بۆ کردنە ڕزگاری دەکات و لەژێر ئەو بارمتەیی یەدا دەردەچێت، پاشان کە عەقیقەکەی بۆ کرا ئەمجا ئەو منداڵە کەڵك دارو بەکەڵك و سوود بەخش دەبێت بۆ خاوەنەکەی، چونکە ئەو عەقیقەیە وەکو قەرزوایە، کە کرا وەکو وایە ئەو قەرزە درابێتەوە، وە کە ئەو منداڵە ئەو قەرز و بارمتەییەی لەسەر نەما ئەمجا بەکەڵك و سوودمەند دەبێت بۆ خاوەنەکەی.(بەسوودوەرکرتن لەپەرتوکی–پوختەی فیقهی شەریعەت–م. تارق هەمەوەندی، بابی کوێزەبەنە لاپەرەی (٢٠٨ –٢٠٩) .

[1] پرسیار: ئایا بۆچی لەعەقیقەدا دەبێت دوو مەڕ لەبری کوڕێك سەربیرپیەت ، وە بەڵام بۆ کچێك دەبێت یەك مەڕی لە بری سەربیرپیەت ؟ ئایا ئەمە لە بەرژەوەندی کوڕدایە؟

وەلآم: نەخێر ، سوێند بە پەروەردگار وەلآمەکەی ئەوە نییە کە شەیتان خێرا دەیکات بەگومان و دەیخاتە ناو ناخی مرۆڤەوە ، کە ئەمە جیاوازی کردنە لەنێوان "کورو کچ"دا ، نەخێر وا نییە، بەڵکو:

وەکو لەپێشەوە لەباسی عەقیقەدا باسکرا ، کە هەر منداڵێك کە لە دایك دەبێت، ئەوا ئەو منداڵە وەکو بەرەهن و بە بارمتە لەبری شتێکدا دانرابێت وایە، وە ئەو منداڵە وەکو گل دراوەیەك وایە کە لەبری وەکو بلێی قەرزێك دانرابێت ، وە دووبارە وەکو رەهینە وایە کە رەهینە واتاکەی: ئەوەیە کە وەکو دەست بەسەر گیراوێك و بەندکراوێك وایە، پاشان کە ئەو منداڵە ی کە لە دایك دەبێت لەم نارەحەتییانە نەجاتی نابێت ئیللا بەوە نەبێت کە دەبێت عەقیقەو گوێزە بانەی بۆ بکرێت، وە هەروەها ئەو منداڵە سوودمەند و بەسوود و بەکەڵك و پڕ خێرو بەرەکەت نابێت بۆ خاوەنەکەی ئیللا دەبێت دایك وباوکی ئەو عەقیقەی بۆ بە ئەنجام بگەیەنن ، ئەمجا بەسوود دەبێت ئەو منداڵە بۆ خاوەنەکەی، کەواتە: ئائەمەیە سوودی عەقیقە کردن بۆ منداڵ. بەلآم کە بۆ کچ یەك حەیوانە و وە بۆ کوڕ دوو حەیوانە، لێرەدا گەورەیی و فەزڵ و پاك و بێ گەردی ئافرەت لای خودا دەردە خات لەمەدا ، چـۆن؟ :-

١- زۆربەی خراپەی سەر زەوی و شەڕوشۆڕ کوڕ ئەنجامی دەدات کە گەورە بوو، بەلآم کچ نە لەبچوکیدا و، وە نە لەگەورەیەتیشدا دەستی لەو خراپەکارییانەدا نییە، کەواتە: هەر لەمناڵییەوە دەبێت خێری زۆرتر بۆ ئەو منداڵە کورە بکرێت تا خوای گەورە سوودمەندی بکات و بەکەڵکی بکات بۆ خاوەنەکەی وە بۆ خەڵکیش ، هەتا بەهۆی ئەم سوودمەندی بوونەیەوە خەڵکی لە شەڕی پارێزراو بن، کە لە بەرامبەری دا کچ پاکترە لە کوڕ بەخێرێکی کەمتر (کە یەك حەیوان سەربڕینە بۆی) سوودمەند دەبێت بۆ خاوەنەکەی و وە بۆ کۆمەڵگەکەیشی .

٢- کچ بەیەك حەیوان لەو وەکو قەرز بوونە ڕزگاری دەبێت، بەلآم کوڕ دەبێت دوو حەیوانی بۆ بکرێت، ئەمجا نەجاتی دەبێت لەو وەکو قەرز بوونە.

٣- کچ لەو رەهن بوون و بەبارمتە دانراو،و وە لەو کۆت بوون و دەست بەسەرگرتنە دا بەیەك حەیوان سەرِین بۆی خوا ڕزگاری دەکات، بەلآم کوڕ بەدوو حەیوان سەربڕین بۆی ئەمجا لەو بە بارەمتەبوونە خوا نەجاتی دەدات.

٤- کچ بەیەك حەیوان کردن  بەخێر بۆی خوای گەورە دەیکات بە سوودمەند و بەکەڵك و پڕخێرو بەرەکەت بۆ خاوەنەکەی ،بەڵام ئەگەر کوڕ دوو حەیوانی بۆ نەکرێت پڕ خێرو سوودمەند نابێت بۆ خاوەنەکەی، کەوا بوو: ئەگەر کوڕێك یەك حەیوانی وەك کچێك بۆ بکرێت بەخێر هەر سوودمەند نابێت، بەڵکو هێشتا لەژێر خانەی بێ کەڵکیدا دەرنەچووە، وەکو بڵێی دەبێت خێری زۆرتری بۆ بکرێت ئەمجا پاك دەبێتەوە و سوودمەند دەبێت.

٥- کچ بەیەك حەیوان خوای گەورە  پوخت وپاڵفتە و پاك وبێ گەردی دەکاتەوە، وەلەبێ کەڵکییەوە دەیکا بە بەکەڵك‌و بەسوود ،بەڵام کوڕ بە دوو حەیوان ئەمجا پاك و پوخت دەبێتەوە و بەکەڵك دەبێت.

کەواتە: خوای گەورە بە بەزەیی تر سەیری ئافرەت دەکات وەکو لەپیاو، وە هەروەها هەر لەمنداڵیشەوە خوای گەورە ئاسانکاری بۆ کچ زۆرتر دەکات،و وە بەئاسانی لەو بێ کەڵك بوون و بارمتەو کۆت بوونە نەجاتی دەدات، بەڵام بۆ کوڕ بە زەحمەت تر نەجاتی دەدات لەو بارمتەو کۆت بوونە و وە بەکەڵکی دەکات، وە کچ لای خوا پاك ترە ەبێ گوناھ ترە وەك لە کوڕ، بۆیە  یەك حەیوان سەربڕین لەبری کچێك دانراوە .

کەواتە: هەر کەسێك ئاسانکاری بۆ بکرێت، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو کەسە خاوەن پلەو ڕێزو جێی بەزەیی و ڕەحم و پاشە ڕۆژێکی بەرزو بڵندترە، لەو کەسەی کە بەزەحمەت تر کاری بۆ ئاسان دەکرێت، کەوا بوو ئێستا بۆیە بۆ کچ یەك حەیوانە وە بۆ کوڕ دوو حەیوانە.

یاخود لەبەر هۆیەکی ترە، کە ئەوەیە: ئەگەر بۆ کچیش وەکو هی کوڕ وا بووایە: واتە: بۆ کچیش دوو حەیوان بووایە، ئەمجا ئەو کچە لەو بارمتەیی بوونە ڕزگاری دەبوو، یاخود کچیش وەکو کوڕ ئەگەر وابوایە کە خێری زیاتری بۆ نەکرایە سوودمەند نە دەبوو، ئەوا لێرەدا کوڕ لای خەڵکی نەزان زۆر خۆشەویستە، نەك دوو حەیوان، بەڵکو دە حەیوانیش بوایا  بۆیان دەکرد، بەڵام کچ دوو حەیوان بووایە، دەیان ووت: ئا دوو حەیوان بۆ دەڵە شرێك بکەین!! بەڵام بۆ ئەوەی بەڵکو ئەو کچە عەقیقەی هەر بۆ بکەن،وە لەو بارمتەیی بونە  ڕزگاری ببێت، بۆیە یەك حەیوانی بۆ دانراوە. بەڵکو بۆئەوەی دایك و باوکی دەستیان لەدڵیان بێتەوە، و بڵێن: یەك

خەڵکیدا، یاخود گۆشتەکەی دەکرێت بەچێشت و نان و وە خەڵکی بۆ دەعوەت دەکرێت ،وە خەڵکەکەیش دەپاڕێنەوە بۆ ئەو منداڵە و داوای بەرەکەتی لەخوای گەورە بۆ دەکەن، ئەمەش بەبەڵگەی ئەو فەرموودەی کە (ئیمامی ئەحمەد) و (ئەبو داود) و (نەسائی) گێراویانەتەوە وە شێخ ئەلبانیش بە صەحیحی داناوە لە (الارواء)دا بەژمارە (١١٦٥) لە (سمرة)وە – ڕەزای خوای لێ بێت- کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (**كلُّ غلامٍ رَهينة بعقيقةٍ، يذبَح عنه يومَ سابعه، ويحلق رأسه ويسمى**)، واتە: هەموو منداڵێك بارمتەیە، و بەستراوەتەوە بەو عەقیقەوە هەتا بۆی دەکرێت، لەڕۆژی حەوتەمدا حەیوانی بۆ سەردەبڕێت و وەسەری دەتاشرێت، وە هەر لەو ڕۆژەشدا ناوی لێ دەنرێت.
وە ئیمامی (ترمزی و حاکیم) فەرموودەیەکی تریان گێڕاوەتەوە و شێخ ئەلبانیش بەصەحیحی داناوە لە (الارواء) دا بەژمارە (١١٤٩) لە( ئیمامی عەلی) ەوە -ڕەزای خوای لێ بێت- کە پێغەمبەر (ﷺ) بەفاتیمەی کچی فەرموو کاتێك کە (حەسەن)ی بوو: (**يا فاطمةُ، إحلقي راسهُ وتصدقي بزنةِ شعرهِ فِضّة**).
واتە: ئەی فاتیمە، سەڕی کوڕەکەت بتاشەو، وە بەئەندازەی سەنگ و قورسایی قژی سەری زیو ببەخشەوە.

---

حەیوانە قەینا بۆی دەکەین، تا ئەو کچەش ئەو خێرەی هەر لەمنداڵیەوە بە نسیب ببێت .

## ٤٢- ماچ کردنی پاره: تقبيلُ النقود

هەندیٚ لەبازرگانەکان یەکەم پارە ماچ دەکا کە وەریدەگریٚت لەیەکەم شت فرۆشتنیدا کە دەیفرۆشیٚت لەسەرەتای ئەو ڕۆژەدا. وە ئەمەش هیچ بناغەیەکی نییە لەشەرعی ئیسلامدا[1].

## ٤٣- ماچ کردنی نان و سەمون لەدوای هەلگرتنەوەی لەزەوی:

هەندیٚ کەس ئەگەر پارچە نانیٚك، یاخود پارچە سەمونیٚکی دۆزییەوە کە فریٚ درابووە سەر زەوی هەلّی دەگریٚتەوە و پاشان ماچی دەکات. بەلاّم ئەوەندە هەیەکە هەلٚ گرتنەوەی نان و پاراستنی لە فریٚدان ئەمە چاکترین شتە، لەبەرئەوەی فریٚدانی نان ئیسراف و دەست بلاّوی کردنە، وە پیٚویستە ئەو نانە کە مرۆڤ هەلّی گرتەوە پاکی بکاتەوە، یان خۆی بیخوات یاخود دایبنیٚ بۆ پشیلەیەك، یان سەگیٚك یان بۆ ئاژەلیٚکی تر، بەلاّم ماچ کردنی لەدوای هەلگرتنەوەی شەرعی نییە و وە دروستیش نییە.

وە ئەو قسەیەی کە ووتراوە: (اکرموا الخُبزَ، فإنَّ اللهَ اکرمهُ، فَمَن اکرمَ الخُبزَ اکرمَهُ اللهُ)، واتە: ڕیٚز لەنان بگرن. چونکە خوا ڕیٚزی لەنان گرتووە، وە هەر کەسیٚك ڕیٚز لەنان بگریٚ خوا ڕیٚزی لیٚ دەگریٚ.

---

[1] ماچ کردنی پارە لای خەلّکی ئیٚمە :

- لەناو هەندیٚ لە خەلّکی ئیٚمەدا کە لەبەیانیدا یەکەم شتی فرۆشت، یاخود هەندیٚ سایەق کە یەکەم نەفەری سەرخست، یان هەر کەسیٚك لە خەلّکانیٚکی تر کە یەکەم پارەیان هەتا دەست، ئەو پارەیە ماچ دەکەن و دەیخەنە سەر ناوچاوانیان و دەلّیٚن: خوا نەیبریٚت! سوفتاحی بەیانییە، یان سوفتاحی ئەمڕۆیە.

- بەلاّم لەسەر پارە شتیٚکی تر هەیە: کە هەر کەسیٚك لە هەر کاتیٚکدا بەری دەستی خورا، دەلّیٚت: ئەوا ئەمڕۆ پارەم بۆ دیٚت!!.

ئەم قسەیە ئیمامی (طبرانی) لەپەرتووکی (الكبیر)دا گێڕاویەتیەوە،ووە شێخ ئەلبانیش لە (ضعیف الجامع)دا فەرموویەتی: موضوعٌ[1]، واتە: قسەیەکی دروستکراوو هەڵبەستراوو درۆیە .

بەڵکو بەجێگیری فەرموودەیەك هاتووە لە (صەحیحی موسلیم)دا کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (إذا سَقَطَت الُقمةُ مِن احدِكم، فَليَمطْ مابها من أذى وَليأكُلها ولايَدَعُها للشيطان)، واتە: ئەگەر پارووییەك لەدەستی یەکێ لەئێوە کەوتە خوارەوە با هەڵی بگرێتەوە،وپاکی بکاتەوە لەپیسییەك ئەگەر تێوەی چوو بێت، وەبا بیخوات، وە بەجێی نەهێڵێت بۆ شەیتان[2].

---

[1] لە (ضعیف الجامع)دا بەژمارە (١١٢٥) هاتووە، وە لە (السلسلة الضعیفة) دا بەژمارە (٢٨٨٥) دا هاتووە.

[2] لای خەڵکی ئێمە ئەم شێوازە ڕێك وەکو کە نووسەر باسی دەکات هەیە لەناوماندا:-
- کە لەسەر جادە یان لەشوێنێك پارچەیەك نان کەوتبوو هەڵی دەگرێتەوە و دەیخەیتە سەر سەری، و دەڵێت: ئەمە گوناحە ئەمە قورعانە بۆ فڕیان داوە لێرە.
- یاخود شێوازێکی تر هەیە لای خەڵکی کە زۆرشتێکی خراپە،کەئەویش ئەوەیە:- ئەگەر کەسێك دەنکێك ترێ یاخود بۆڵە ترێیەکی بچوکی لەدەستی کەوتە خوارەوە، یان تیکەیەکی لەدەست کەوتە خوار، یان کلۆیەك شەکر یان پارچەیەك نانی لەدەست کەوتەخوار، ئیتر هەڵی ناگرێتەوە و پاکی بکاتەوە، یان خۆی بیخوات یان بیدات بەباڵندەیەك تا بیخوات، بەڵکو بەجێی دەهێڵێن و دوایش دەکرێتە ناو تەنەکەی خۆڵەکەوە، یاخود ئەگەر وورده نانیان هەبوو لەشوێنێکی پاکدا داینانێن، بەڵکو دەیکەنە ناو تەنەکەی خۆڵەوە، یان ئەگەر موورییەکی لەناو قاپێك خواردندا بینی، ناچێت دەریبهێنێت، بەڵکو نایخوات و دەیرێژێن و قاپێکی تر تێدەکەنەوە، کە هەموو ئەمانە ئیسراف کردنە.

### ٤٤- مـاچ كردنى دەسـت: تقبيلُ اليد

هەندێك لە خەڵكى ئەگەر پرسيارى لێكرا لەبارەى ژيان و گوزەرانييەوە، پـشتى دەسـتى پاشان دواى ئـەوە بـەرى دەستى ماچ دەكـات، تـا ئـەم شێوازە ئاماژە بێت بۆ سوپاس و ستايش كردنـى خـوا، وە ئـەم كارەش بيدعەيـە، وە ڕاسـتيەكەى ئەوەيـە كـە ئـەو كەسـە كـە پرسـيارى لێكـرا لەبارەى ژيان و گوزەرانييەوە دەبێت سوپاسى خواى پەروەردگار بكات، و بڵێت: (الحمدُلله)، واته: سوپاس و ستايش بۆ خواى گەورە. وە ئەگەر هـەواڵێكى خۆشـى بـۆ هـات يـەك سـوجدەى شـوكر ببـات، بـەبێ ئـەوەى سەلام دانەوەى تيادا ببێت[1].

### ٤٥- ئاهەنگ گـێڕان بەبۆنەى جەژنە دروستكراوەكانەوە: الاحتفالُ بالأعيـاد المبتدعة.

وەك جەژنى سەرى ساڵ، جەژنى كرێكاران، جەژنى سەربەخۆيى وولآت، جـەژنى لاچـوونى بـەلآ، وە جـەژنى سـەركەوتن، ئـەمجا ئـەم جەژنانـە هەموويان نـەهـى و قەدەغـەيـان لێكراوە لە ئيسلامدا، لەبەر سێ هۆ:

١- لەبەرئـەوەى ئـەم جەژنانـە كۆمـەڵ جـەژنێكى بيدعـەن، ووە شـەرعى و دروست نين.

---

[1] لاى ئێمـە هەنـدێك كـەس هەيـە كـە پرسـيارى لێ بكـەى و بڵێـى گوزەرانـت چـۆنە، لـەجياتى بڵـێ: سـوپاس بـۆ خـوا، دێـت بەتـەنها پـشتى دەسـتى مـاچ دەكـا و بـەرە ناوچاوى دەستى بەرزدەكاتەوە، تا ئـەم دەسـت جووڵاندنـەى ئامـاژە بێـت بـۆ چاكى حاڵ و گوزەرانى.

- يـاخود هەنـدێك كـەس كـە هـەواڵێكى خۆشـى بيـست، دێـت دەسـتى دەبـات بـۆ چەناگەى،يان هەر دوو دەستى دەهێنێت بە دەم وچاويدا،و ئەمجا دەڵێت:( الحمدُ لله).

٢- بۆ شوێن کەوتووانی دینی ئیسلام، تەنها دوو جەژن هەیە: جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان، وە لە هەردوو صەحیحەکەیشدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إنَّ لِكُلِّ قومٍ عيداً، وهذا عيدُنا)، واتە: بەڕاستی بۆ هەموو گەل ونەتەوەو کۆمەڵێك جەژنێکیان هەیە، و ئائەمەش (جەژنی ڕەمەزان و قوربان) جەژنی ئێمەن.

٣- کردنی ئەم جەژنانە خۆ شوبهاندنە بەکافرانەوە، وە ئێمەی موسوڵمانیش فەرمانمان پێکراوە، کە بەپێچەوانەی ئەوان بین و سەرپێچی ئەوان بکەین[1].[2]

## ٤٦- سوێند خواردن بەغەیری خودا: الحلفُ بغيرِ الله

لەناو خەڵکیدا کەسانێکی وا هەیە سوێند بەغەیری خودا دەخوات لە قسەکانیدا، وەکو ئەم سوێندانە:

- وحياتك. واتە: بەژیانی تۆ.
- بذمتك. واتە: بەئەستۆی تۆ.
- والعيش والملح. واتە: بەژیان و خوێ.

---

[1] سەیری پەرتووکی "المنظار"ی "شێخ صالح ال الشيخ" بکە، لاپەڕە( ١٨).

[2] جەژنە درۆینەکانی لای ئێمە:

- جەژنی نەورۆز، جەژنی سەری ساڵ، جەژنی عیدولمیلاد، جەژنی کرێکاران، جەژنی مامۆستایان، جەژنی دایکان، جەژنی دارودرەخت.

ئەمجا ئەو ڕۆژانەی کەکراون بەبۆنە:

ڕۆژی ئافرەتان، ڕۆژی خۆشەویستی (ڤەلەنتینە)، ڕۆژی گەنجان و لاوان، ڕۆژی ئەنفال، ڕۆژی ڕاپەڕین، یادی کۆڕەوەکە.

- یاخود ڕۆژی پشووی سەرتاشخانەکان، ڕۆژی وێنەگرەکان، ڕۆژی چێشتخانەکان، ڕۆژی منداڵان، ڕۆژی کەم ئەندامان و،.......هەتاکۆتایی.

- والنبي. واته: بەپێغەمبەر (ﷺ).

وە هەموو ئەم سوێندانەش سوێند خواردنە بەغەیری خوا، ئەویش بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی کە ئیمامی (حاکیم) گێڕاویەتیەوە ووە بەصەحیحشی داناوە، وە ئیمامی (ترمذی)ش دووبارە گێڕاویەتیەوە ووەبە (حَسَن)ی داناوە، وە شێخ ئەلبانیش بەصەحیحی داناوە لە (الارواء)دا لە (ابن عمر)ەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مَنْ حَلَفَ بغير اللهِ فقد أَشـرَكَ)[1]، واتە: هەر کەسێك سوێند بەغەیری خوا بخوات، ئەوا ئەو کەسە شەریکی بۆ خوا بڕیارداوە.

وە هەر کەسێکیش زمانی ڕاهاتبێ و، وەخوی پێوەگرتبێ بەم جۆرە سوێندانەوە، ئەوا هەر کاتێ هەڵەی کردوو وە سوێندی بەغەیری خودا خوارد بابڵێ: (لا اله الاّ الله)، ئەمەیش بە بەڵگەی ئەو فەرمودەیەی کە شەییخان (بوخاری و موسلیم)، گێڕاویانەتەوە لە "ابی هریرە"ەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (مَن حَلَفَ منكم فقال في حِلفـه: و الـلاّتِ والعُزى. فليَقُلْ: لا اله الاّ الله. ومَن قال لصاحبه: تعال أُقـامرك. فليتَـصدق بـشيءٍ)[2]، واتـە: هـەر کەسێك لـەئێوە سوێندی خـوارد و، ووتـی لـە سـوێندخواردنەکەیدا: بـەلات و عـوززا، بـابڵێ: لا الـه الاّ اللهُ. وە هـەر کەسێك بەهاوڕێکەی ووت: وەرە با قومارت لەگەڵدا بکەم، با ئەو کەسە شتێك بکات بەخێرو صەدەقە.[3]

---

[1] حديثٌ صحيح: رواه الحاكم وصححه، والترمذي وحسنه، وصححه الالباني لە (صحيح الجامع)دا بەژمارە (٦٢٠٤)، وە لە (السلسلة الصحيحة)دا بەژمارە (٢٠٤٢).

[2] حديثٌ صحيح: رواه البخاري و مسلم.

[3] جۆرە سوێندی هەڵە لەناو خەڵکی ئێمەدا، وەکو:-

## ٤٧- سوێند خواردن بەسپاردە: الحلفُ بالأمانة

زۆرێك لە خەڵكی سوێند بەسپاردە دەخوات[1]، وە ئەمەش جۆرێکە لە سوێند خواردن، وە لەبارەی ئەم جۆرە سوێندەوە نەهی و قەدەغە کردنێکی تایبەتی لەسەر هاتووە، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەی کە ئیمامی "ئەبو داود" گێڕاویەتیەوە،وە شێخ ئەلبانیش بەصەحیحی داناوە لە (الصحيحة)دا بە ژمارە (٩٤) لە "برُیدە"ەوە -ڕەزای خوای لێ بێت- کەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (مَنْ حَلَف بالأمانة فليسَ مِنّا)، واتە: هەر کەسێك سوێند بەسپاردە بخوات لەئێمە نییە.

---

- بەچاوی تۆ و بەچاوی هەردووکمان، بەچاوی ئەو کوڕە تاقانەیەت، بەشەرەفم، بەکەرامەت و ویژدانم، بەتەلاقم، بەژیانی تۆ، یان دەڵێت: سوێند بێت، ئیتر هیچی تر نالێت، بەڕەنگی زەردت، بەگەردنم، بەدۆستایەتی هەردووکمان، بەناموسم، یان دەڵێت: سوێندت بۆ ئەخۆم بەرهەچی شتێ کە تۆ بیلێیت، بەو هەورە، بەو ئاسمانە شینە، تۆ دارو بەرد.

- یاخود بەقەبری پێغەمبەر، بەسەری پێغەمبەر، بەمولودی پێغەمبەر، بەشەرفی پێغەمبەر، بەکڵاوە سەوزەکەی پێغەمبەر، بەقیبلەی محمدولمستەفا، بەنوری پێغەمبەر، بەو ئاگرو ئاوەی پێغەمبەر، بەڕیشە سپییەکەی پێغەمبەر، بەگشت پێغەمبەران، بەچل و چوار هەزار پێغەمبەر.

- بەسەری خۆم، بەسەری باوکم، بەسەری هەردووکمان، بەقەبری فلان شێخ، بەگۆڕی شەهیدان، بەقەبری باوکم، بەقەبری دایکم، بەقەبری جوانە مەرگە.

- تو دینت، بەدینت، بەو خۆرو مانگە، بەو مانگە شەوە، بەڕۆژی قیامەت، بەدینی ئیسلام، بەمەککەو مەدینە، بەئەصحابە، بەم مانگی ڕەمەزانە.

- بەو گەنمەی کە لەو ئەرزە ڕەقەوە پەیدائەبێت، یاخود کەسی وا هەیە کە دەست ئەدا بەناندا و دەڵێت: بەم قورعانە، بەو ئاردو ئاوە، بەو کەعبەی شەریفە.

[1] نووسەر کە دەفەرموێت: زۆرینەیەك لەخەڵکی سوێند بەسپاردە دەخوات، مەبەستی بەخەڵکی میسرە، ئەگین ئەم جۆرە سوێندە سوپاس بۆ خوا لای ئێمە نییە.

**٤٨- باوەڕبوون بەوەی کە وا هەندێ کەس قەدەغە و بەرگری لەڕەحمەتی خوا دەکەن:**

هەندێ لە خەڵکی ئەم قسە دەکات بەرامبەر بە خەڵکێکی تر، ودەڵێت: (لایرحم ولا یبخلي رحمة ربّنا تنزل)، واتە: نەخۆی ڕەحم دەکا، وە نە دەشهێڵی ڕەحمەتی پەروەردگار بباریت بەسەرماندا.

ئەم قسەیە پەندێکی پووچ و ناڕاستە، وەبیروباوەڕێکی هەڵەیە. لەبەرئەوەی هیچ کەسێك کە هەر چۆنێك بێت حاڵ و تواناو دەسەلاتی، ناتوانێ و وەتوانای ئەوەی نییە کە قەدەغەو بەربەست و بەرگری دەبەزێنی ڕەحمەتی خوا بکات. وە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿مایفتح اللهُ للنّاسِ مِنْ رَحمةٍ فلا مُمْسِك لها﴾، واتە: ئەوەی کە خوا دەیدات و دەیبەخشێت، بە بەندەکانی لەڕزق و ڕۆزی و باران و بەفرو تواناو لەش ساغی و ئاسایش و زانیاری و حیکمەت و پێغەمبەرایەتی و بیرو هۆش‌و، وە هەموو ئەو شتانەی کە نایەنە ژماردن، وە هەر کاتێکیش کە پەروەردگار دەرگای ڕەحمەتی خۆی لەخەڵکی بکاتەوە، ئەوا هیچ کەسێك و هیچ هێزێك توانای قەدەغەکردن و وەستاندنی ئەو ڕەحمەتەی خودای نییە،وەك دەفەرموێت: ﴿وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ (فاطر: ٢).

واتە: هەر نیعمەتێ کە خودا قەدەغەی بکات وە بیگێڕێتەوە و بیوەستێنێت، ئەواهیچ کەس و هێزێك ناتوانێت دوای ئەو گرتنەوەیە بەری بدات و بیداتەوە بە خەڵکی، وە خودا خۆی تەنها خاوەن تواناو دەسەلاتێکی بێ سنوور و بێ ئەندازەیە، کە کەس توانای ئەوەی نییە بەرامبەری بوەستێت، وە لەگشت کارەکانیدا خاوەن حیکمەت و کاربەجێی یە.

وە فەرموویەتی پاك و بێگەردی بۆ ئەو: ﴿قُلْ: أفَرأَيتُم ماتَـدْعُوْنَ مِـنْ دون اللهِ إنْ أرادني اللهُ بضُرّ هَلْ هُنَّ كاشفاتُ ضُـرِّهِ﴾، واتـە: ئەی پێغەمبەر تـۆ بەوان بڵێ: ئەوانەی کە ئێوە لەباتی و لەجیاتی خودا دەیان پەرستن و هاواریـان لێ دەکـەن و هۆمـەنیان بـۆ دەبـەن، ئەگـەر خـودا بیـەوێت مـن تووشی نارەحـەتی و زەحمـەتێك بكات، ئایا ئەوانەی کە لەغەیری خـوا هاواریـان لێ دەکـەن، دەتـوانن ئـەو نارەحـەتی و ناخۆشـی و زەحمەتـەم لەسـەر لاببـەن،﴿ أَوْ أَرَادَنِي بِرَحْمَةٍ هَلْ هُنَّ مُمْسِكَٰتُ رَحْمَتِهِۦ﴾ (الزمر: ٣٨)، وە ئایا ئەگـەر خـودا بیـەوێت خێرو خۆشـی و ڕەحمـەتێکی خۆیم بێ ببەخشێت، ئایا ئەوانە دەتوانن ڕێگای ئەو ڕەحمەتەی خودام لێ بگرن و لێمی قەدەغە بکەن، ئایا دەتـوانن ببنـە کۆسپم و بەربەسـت تـا نەهێڵن ئەو خێرەم بەنسیبم ووە تووشم ببێت.

## ٤٩- ڕازی نـەبـوون بـەقـەزاو قـەدەر: الاعتراضُ على القضاءِ والقدرِ

هەندێ لە خەڵکی کە پیاوێکی دەوڵەمەند دەبینێ ووە ئەم دیمەنەی بە دڵ نەبێت، ئـا ئەم قسە پیسە گوناهاوییە دەکات: (يَدَيَّ الحلقُ للي بلا ودانِ)، واتە: دوو دەستەکەی من بەستراون و لەئیش کەوتوون، بەهۆی یەکێکەوە[1] کە سۆزو ڕەحمی نییە.

وەئەم پەندە واتاکەی ئەوەیە: کە خوای گەورە کاربەجێ و لێزان نەبووە لـە بەخشینەکانیدا، وە لـە قەدەغـە کـردن و پێنـەدانی ئـەو بەخشینانە بەکەسـانێکی تـر -حاشـا لله- ،بـەباوەڕی ئـەو کەسـە خـوا ڕزق و ڕۆزی دەدات و دەبەخشێت بەکەسانێك کە شیاوی ئەو بەخشینە نین، وە ئەو

[1] مەبەست بەو یەکە: پەنا بەخوا (خوای گەورە و میهرەبانە).

ڕزق و ڕۆزیەش قەدەغە دەکات لەکەسانێك کە شیاوی ئەوەن کە پێیانی ببەخشێت!!

بەلاّم ئایا ئەو کەسەی کە ئەم قسە دەکات زاناترە لە خوا بەو کەسانەی کـــە شیاوی ئەوەن کە لەلایان خواوە ڕزق و ڕۆزیان پێ ببەخشرێت؟!!.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمْ يَعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ (الزمر: ٥٢)، واتـــە: ئایـــا ئەوانە نازانن بۆ هەر کەسێك کە خودا خۆی بیەوێت ڕزق و ڕۆزی بۆ فراوان دەکات، وە بۆ هەر کەسێکیش کە بیەوێت ڕزق و ڕۆزی کەم دەکاتەوە و لێیانی دەگرێتەوە، بەپێی ئەو مەبەست و ئەندازە گیری و حیکمەتەی کە خوا خۆی دەیزانێ، بەڕاستی لەم بەخشین و قەدەغە کردنەیدا بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر تواناو دەسەلاّتی خودا بۆئەوانەی کە ئیمانیان بەخودا هەیە.[1]

---

[1] لای خەڵکی ئێمە، ئەگەر کەسێکیان بینی و ماڵ و سەروەتی هەبوو، وە لەلای ئەوان بەشیاوی نەزانن کە ئەو کەسە خاوەنی ئەم سەروەت و سامانە بێت، دەڵێن:

– سەیری ئا ئەوە ناکەی!! بەقوربانی خوا بین پارەی داوە بەکێ، یان توخوا ئا ئەوەو پارەیان ووتووە.

– یان دەڵێن: خوا پارەی داوە بەکەر، یان ئەو کەرەو پارەیان وتووە.

– یان دەڵێن: بە قوربانی خوا بم پارەی داوە بە ئا ئەوانەو نازانن چۆن خەرجی بکەن، یان کەرو بێ عەقڵی ئاوا خاوەنی پارەیە، یان بەقوربانی خوا بین ئەم هەموەی ڕشتووە بەسەریاندا، ئەی بۆخوایە!! نایدەی بە ئێمەش، بۆ ئێمەش عەبدی تۆ نین، یان دەڵێن: ئەگەر پارە بێ قیمەت نەبووایە خوا نەیئەدا ئا بەوانە، یان دەڵێن: خوا پارەی داوە بە کەروگا، ئەوە هی ئەوەیە پارە و سامان و نازو نیعمەت و ماڵ و موڵکی هەبێت.

## ٥٠- قسەی هەندێ لە خەڵکی کە دەڵێت "ڕزقەو بەسەر شێتدا ڕژاوە": رِزقٌ هَبَلَ على المجانين .

ئەمەش پەندێکی هەڵەیە، لەبەرئەوەی ڕزقی گشت بەندەکان – بەخەڵکی عاقڵ و شێتیشەوە– لەسەر (الله)یە کە پەروەردگاری جیهانیانە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزْقُهَا﴾، (هود: ٦) ، واتە: هیچ بەپێ ڕۆیو و خشۆك و باڵندەو زیندەوەرو ئاژەڵێك نییە ئیللا دابینکردنی ڕزق و ڕۆزی بۆیان لەسەر پەروەردگارە.

## ٥١- باوەڕبوون لەشەربەتی بەلەك[1] دا : الاعتقادُ في العرقسوس

هەندێ لەخەڵکی باوەڕیان وایە ئەگەر شەربەتی بەلەك بڕێژرێت لەبەردەم دوکانێکدا ئەوا ئەو شەربەتە بەرەکەت دەهێنێ بۆ ئەو دوکانە، وە ئەگەر هاتوو بەو شەربەتە سەیارەی کرێ (تەکسی) ی پێ بشۆریەت، ئەوا ئەو شەربەتە ڕزق دەهێنێ بۆ ئەو سەیارەیە، وە ئەو سەیارەی تەکسی یە بەمە قازانجێکی زۆر دەکاو،وە نەفەر بەمە زۆرتر ڕوو لەو سەیارەیە دەکات، وە دەست کەوتی خاوەنەکەی زۆرتر دەبێت... سَاءَ ما يَعْتَقِدون!! واتە: بەڕاستی بەباوەڕبوونتان بەم کارە خراپترین بیروباوەڕتان هەیە.[2]

---

[1] بەلەك:– گیایەکە کە لەدەوری چەمدا دەڕوێت، پەڵکو گەڵای هەیە، خۆڵە مێشی یە گەڵاکەی، وە ڕووەکێکی ڕەگدارە و ڕەگەکەی بۆ خۆشتن بەکاردێت، وە بۆنی سیری هەیە، لەبەهاراندا دەڕوێت تا پاییز دەمێنێ، لەگوڵە هێرۆ دەچێت.

[2] باوەڕن بوونی هەڵە لەڕووەکی (بەلەك)دا لەلای خەڵکی ئێمە:

– لەهەندێ لەلادێکان هەبووە، کە ئەگەر کەسێك تووشی ڕەنگ شێتی و بێ تاقەتییەك ببوایە، یاخود ئافرەتێك بەسەر منداڵەوە تووشی نەخۆشی ببوایە،

### ٥٢- باوەڕبوون لەئاژەڵی دەڵەك دا[1] : الاعتقادُ في العرسة

هەندێ لە خەڵكی باوەڕیان وایە لەو ئاژەڵەدا كە ناو دەبرێت بە (العِرسةُ)، واتە: دەڵەك ،كە ئەگەر بخرێتە ژێر گڵەوە لەبەردەم دوكانێكدا بەزیندوویی، ئەوا ڕزق و بەرەكەت دەهێنێ بۆ ئەو دووكانە... هەروەها ئەم كارەش بیروباوەڕێكی بۆگەنە.

### ٥٣- باوەڕبوون لەقەلەڕەش و كۆتری هەردی[2] دا : الاعتقادُ في الغُراب واليمامة .

هەندێك لەخەڵك باوەڕیان وایە لەوەدا كە ئەگەر قەلەڕەش، یان كۆتری هەردی یەكێكیان سەر ببڕیەت لەسەر سەری منداڵێك، ئەوا ئەو منداڵە دوا دەكەوێت لەزمان پژان و قسەكردن.

وە ئەمەش ناڕاستە. لەبەرئەوەی ئەم كارە بەدەستی خوای پەروەردگارە بەتەنها.[3]

---

دەچوون بنكە بەلەكیان دەهێناو چەند ڕۆژێك دەیان كولاند پاشان دایان دەنا تا سارد دەبۆوە، وە دوایی خۆیان پێ دەشۆری بەمەبەستی چاك بوونەوەو، وە بەپیرۆز دانانی ڕووەكی بەلەك.

بەلام باوەڕبوون لە بەكارهێنانی ڕووەكی بەلەكدا بەمەبەستی شیفای نەخۆشی لەناو خەڵكی وولاتانی تریشدا هەیە، بەتایبەت لەناو خەڵكی میسردا كە بۆ مەبەستی شیفای نەخۆشی لەناو قاپێكدا دەیكولێنن و ئەمجا بۆنەكەی هەڵ دەمژن.

[1] دەڵەك: ئاژەڵێكی چوار پێیە لە پشیلە بچوكترە، لەڕێوی دەچێت، وە كەڵبەدارە و یەكێ لەخواردنە سەرەكییەكانی مشكە.

[2] واتە: كۆتری شینەكە كە بەزۆری بەسەر منارەی مزگەوتەكانەوە دەنیشنەوە.

[3] باوەڕبوونی هەڵە لەقەلەڕەش دا لای خەڵكی ئێمە، وەكو:-

## ٥٤- بــاوەڕبــوون لــەقــۆڕی[1] دا: الاعتقادُ في الحرباء

باوەڕییان وایە خەڵکانێ ئەگەر قۆڕی فڕێ درایە سەر ئافرەتێکی نەزۆك، وە ئـەو ئافرەتـە داچـڵەکی و ترسا، ئـەوا سـك پـڕ دەبێـت، وە ئەمـەش دووبارە پـووچ و ناڕاسـتە، لەبەرئـەوەی ئـەو ذاتـەی ﴿يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَٰثًا ۖ وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا﴾ (الشورى: ٤٩-٥٠)، واتە: دەیبەخشێت کچ بەو کەسەی کە خۆی دەیەوێ ،وە کـوڕیش دەبەخـشێت بـەو کەسـەی کـە خـۆی دەیـەوێ، یـاخود بەهەندێکیش کچیش و کوڕیشیان پێ دەبەخشێ، وە هەندێکیش نەزۆك دەکا و منـداڵی نـاداتێ، ئـەو زاتـەی کـە ئەم کارانە ئەنجام دەدات تـەنها (الله)یە.

---

- دەڵـێن: قەلـەڕەش و قـشقەڕە بەسـەر ماڵتـا بـڕوات و بقیڕێنێـت، ئـەوا مردووت لێ دەمرێت!!، یاخود قەلەڕەش بەسەر هەر شارو گوندێکدا بقیڕێنـێ، ئـەوا ئـەو شوێنە چۆڵی دەکەن.

- بەلاّم لای ئێمە باوەڕیان بەکوکوختی هەیە نەك کۆتر، دەڵێن: کوکوختی لەهەر ماڵێکدا هێلانە بکات، ئـەوا دەست بۆ هێلانەکەی مەبە، با لەماڵدا بمێنێ، چونکە لەهەر ماڵێکدا هێلانە بکات ئەوە خێرو بەرەکـەت و ئاشتییە بۆ ئـەو ماڵە، بۆیە هـەر ماڵێك کوکوختی هێلانەی تیدابکات زۆر بەم کوکوختیانە دڵ خۆش دەبن و ناوێرن دەستی بۆ ببەن.

[1] قۆڕی: بریتییە لەو خشۆکەی کە چوارقاچی هەیە، و پێستەکەی سەوزێکی کاڵەو بەڵەکی تیایە، وەکو پێستی تیمساح وایە، چاوی دەرپـەڕیوە، بەپێ ی ڕەنگی ئـەو شوێنەی کە تیابژی ڕەنگی خۆی وەك ڕەنگی ئەو شوێنە لێ دەکات، حـەزی لـە ڕۆژەو ڕۆژ لەکوێوە بێت ڕوودەکاتە ئەو شوێنە، پێیـشی دەوتـرێ: (بزن مژە) وە بەفارسی پێی دەوترێت: (بَرْ بَخْتي).

## ٥٥- بـاوەڕبـوون لـە" كـيسـەڵ " دا: الاعتقادُ في السُلحُفاة

هەندێ لە خەڵكی باوەڕییان وایە ئەگەر كیسەڵ لەماڵدا بەخێوبكەن، ئەوا ئەو كیسەڵە ڕزق و بەرەكەت بۆ خۆیان و ماڵەكەیان دەهێنێت[1].

---

[1] هەڵەی خەڵكی لەسەر كیسەڵ:-

- لەم ساڵی ٢٠٠٧ لەمانگی هەشتتدا لەوبازاڕەی سەر سی مەترییەكەی ئازادی، چەند كەسێك كۆمەڵێك كیسەڵیان هێنابوو، بۆئەوەی بەفێڵ بیفرۆشن بە خەڵكی، دەیانووت: خوێنی كیسەڵ شیفایە بۆ پیزۆی دەست و قاچ چاك دەكات و هەڵی دەوەرێنێت.

- بێگومان ئازاردانی "كیسەڵ"یش یەكێكە لەو هەڵەو گوناهانەی كە پێویستە نەكرێت، بۆ نموونە: خەڵكی وا هەیە كە چاوی بەكیسەڵ دەكەوێت یەكسەر دەچێت دەیخاتە سەر پشت و هەڵی دەگێڕێتەوە، دوایی ئەو كیسەڵە زۆر بەناڕەحەت خۆی دەخاتەوە سەردەم و دەڕوات، چونكە ناڕەحەترین شت لای كیسەڵ ئەوەیە كە بكەوێتە سەرپشت، بۆیە كاتێك دوو كیسەڵ شەڕ دەكەن لەگەل یەكتریدا هەریەكەیان هەوڵ دەدات ئەوی تریان ببەزێنێت بەوەی كە بیخاتە سەرپشت، كە خستیە سەرپشت ئیتر بەجێی دەهێڵێت و وەدوایی زۆر بەزەحمەت ئەوكیسەڵە خۆی دەخاتەوە سەردەم، بڕوانە ئەم دوو ڕووداوەت بۆ بگێڕمەوە كە لەدوو لادێی كوردستانی خۆمان ڕوویداوە:-

- لە یەكێك لە لادێكانی سلێمانی كە دەكەوێتەپشت شاخی گۆیژەوە، لەو لادێیەدا چەند ساڵێك ژمارەیەكی زۆر لەكیسەڵ لە لادێكەیاندا هەبووە، هەندێك لەو كیسەڵانە بچوك بوون و، وەهەندێكی تریان گەورە بوون، وە خەڵكی ئەم لادێیە هاتوون ئەو كیسەڵە گەورانەیان كردووە بەقەپان و شایەن و كیلۆ،وە هەر كەسێك ویستبێتی كە بزانێ كێشی قورسە یان نا!!، چووەتە سەر پشتی یەكێك لەو كیسەڵە گەورانەوە، وە كۆمەڵێك خەڵكی زۆریش بەچواردەوری ئەو كەسەدا كردوویانە بەپێكەنین و گاڵتە، ئەمجا دوای ئەوە كە ئەو كەسە چۆتە سەر پشتی ئەو كیسەڵە، ئەگەر كەمێك كیسەڵەكە سەری دەرهێنا بێت،ئەوا خەڵكەكە بەو كەسەیان وتووە: تۆ پەنجا

## ٥٦- بـاوەڕبـوون لـە مقـەست دا : الاعتقادُ في المقص

هەندێ لەخەڵکی باوەڕییان وایە ئەگەر مقەست دەمەکەی بکرێتەوە بەبێ ئـەوەی هـیچ پێویـستییەکت پێـی هـەبێت، وە بـەبێ ئـەوەی ئیشی پـێ بکەیت، ئەوا شەڕو ئاژاوە و بەڵاو ناڕەحەتی دەهێنێ.

وە ئەمەش بیروباوەڕێکی هەڵەیە.[1]

---

کیلۆی!!، وە ئەگەر زیاتر کیسەڵەکە سەری دەرهێنا بێت،بۆ نموونـە بیان وتـووە:تۆ حـەفتا کیلۆیت و قورستری!! چونکە زیاتر قورسایت خستۆتە سەر پشتی ئەو کیسەڵە بۆیـە ملـی زیاتر دەرهێناوە...ئیتر ئابەم شێوەیە، خۆ ئەگەر کەسێك چوو بێتـە سـەر پشتی یـەکێك لـەو کیسەڵانە و، بەڵام سەری دەرنەهێنا بێت خەڵکەکە گاڵتـەیان پێکـردووە و پێیـان وتـووە: تۆ قەپان ناتخوێنێتەوە!!!.

– یەکێکی تر لە دانیشتوانی لادێیەکی تر دەڵێت: جارێك ویستم کیسەڵێك بکوژم و پشتە ڕەقەکەی بۆ جوانی هەڵبگرم لەلای خۆم، دەڵێت: هاتم کیسەڵێکم هێنا و خستمە سەرپشت، بەڵام بۆئـەوەی ئـیتر جارێکی تـر نـەتوانێت خـۆی بخاتـەوە سـەر پـشت تادەمرێت، هـاتم قـوڕێکی شـلم بـۆ گرتـەوە و وەلەسـەر پشت خـستمە نـاو قوڕەکـەوە، وە هـەرکاتێکیش کـە قوڕەکـە ووشـك بۆیـەوە ئـیتر هـەر ناتوانێـت خـۆی بخاتـەوە سـەردەم بـۆ ئـەوەی لەبرسـاندا بمرێت، وە کەمرد ئیتر لەبەرخۆردا ووشك دەبێتەوە و دەتوێتەوە، دوایی منیش ئەو قاپوڕە ڕەقەی دەبەم بۆ خۆم، دەڵێت: بەڵام لـەو شوێنەی کە ئـەم کیسەڵەم وا لێکرد کێڵگە بوو وە لـەنزیکی کێڵگەکـەدا چـەڵتوکی برنجـی لێ کرابوو، ئـەمجا کیسـەڵەکەم بـەجێ هێشت تـا دوو هەفتە پێم نەکرا بچمەوە بەلایدا، کە دوای ئەم ماوەیە چوومەوە تابزانم چی بەسـەر هاتووە، دەڵێت ووتم: بەخوا ئێستا هەر قاپۆڕەکەی بۆمن ماوە و خۆی مردووە، دەڵێت: کاتێك کە نزیکی کیـسەڵەکە بوومـەوە سـەیر دەکـەم پۆلێـك چۆلەکە وە تـان لەسـەر سـکی کیـسەڵەکە، خێـرا دەچـن بەدەنووك چەڵتوکی بۆ لێ دەکەنەوە و ئەمجا یەك بەیەك دەیهێنن و دەچنە سەر سکی و وە بەدەنووك چەڵتوکەکەی بۆ پاك دەکەن وە دەنکە برنجەکەی بەدەنووك دەخەنـە نـاودەمی، دەڵێت: ئـەو چۆلەکانـە ئەوەنـدە چـەڵتووکیان دابـووێ بەشێوەیەك کـە هـەردوو ئـەم لاو ئـەولای ئـەو کیسەڵە بەرز بـوو بـۆوە لەتوێکلی برنجدا، دەڵێت: وتم بەخوا خوا نایەوێت تۆ بمریت، وە ئـەم چۆلەکانەیشی بۆ تـۆ ناردووە، دەڵێت: ئیتر کیسەڵەکەم خستەوە سەردەم و لێی دا و ڕۆیی.

لا اله الاّ الله، بەڕاستی هەموو سیفاتێکی جوان هەر بۆ تۆ جوانە، و وە هەر بۆ تۆش شیاوە.

[1] بیروباوەڕی هەڵە لەسەر مقەست لای ئێمە، وەکو:

## ٥٧- بـاوەڕبـوون لـەئـاوێنـەدا : الاعتقادُ في المـرآة

هەندێ لە خەڵکی باوەڕییان وایە کە ئەگەر بەشەو سەیری ئاوێنە بکەی دروست نییە، وە هەندێکی تریان باوەڕییان وایە ئەگەر ئاوێنە بەشەو دا بەبێ داپۆشین بەجێ بهێڵیت، ئەوا ئەگەر هاتوو ئافرەتی ئەو ماڵە سکی هـەبوو سـکەکەی لەباردەچـێت.... وە هـەموو یـەکێ لەمانـە باطیـل و ناڕاستە.[1]

## ٥٨- بـاوەڕبـوون لەگسك دانی ماڵ دا : الاعتقادُ في كَنس البيت

هەنـدێك لـەو خەڵکـە باوەڕییـان وایـە ئەگـەر کەسـێك بیـەوێت بچێ بـۆ سـەفەر، وەکاتێـك لەماڵەکـەی خـۆی دەرچـوو بـۆ سەفەرکردنەکەی، لـەو کاتـەدا ئەنـدامانی ئـەو ماڵـە ماڵەکـەیان گـسك دەدا، ئـەوا ئـەو کەسـە موسافیرە لـەو سەفەرەی ناگەڕێتـەوە، بۆیـە ڕەش بـین دەبـن ئەگـەر لـەو کاتەدا کە ماڵەکەی گسك بدرێ.[2]

---

- ئەگەر مقەست بەدەم کراوەیی بەجێی بهێڵیت، ئەوا ئاژاوەی ماڵی پێوەیە!!.
- ئەگەر مقەست بدەیتە دەست هەر کەسێك، ئەوا شەڕت دەبێت لەگەڵ ئەو کەسەدا.

[1] بیروباوەری هەڵە لەناو ئێمەدا لەسەر ئاوێنە، ئەوەیە کە:

نابێت بەشەودا سەیری ئاوێنە بکەیت، چونکە دەڵێن: شێت دەبیت!!، یان جنۆکە دە ستت لێ دەوەشێنێت!! .

[2] لای ئێمە ئەم بیروباوەڕە نییە، بەڵام کۆمەڵێك بیروباوەڕی پڕوپووچی تر هەیە لەسەر سەفەرکردن، وەکو:

- ئەگەر بەری پێت بخورێت، ئەوا سەفەر دەکەیت!!.
- ئەگەر پێڵاوەکانت سەریەك بکەوێت: ئەوا سەفەر دەکەیت!!، وە ئەگەر پێڵاوەکانت ڕووەو هەر شوێنێك سەریەك بکەوێت: ئەوا بەرەو ئەو شوێنە سەفەر دەکەیت!!.

## ٥٩- قسەی هەندێ نەزان" بۆ ئێمە لە سورەتی ﴿عَبَس﴾دەخوێننەوە"[1] :

إحنا بنقرأ في سورة ﴿عَبَس﴾ .

ئەم قسە هەندێ لەخەڵکی نەزانی وولآتی میسر دەیڵێن، ئەگەر قسەیان بۆ کەسێك کردوو وە ئەو کەسە لەقسەکەیان تێنەگات ئەم قسەی بەرامبەر دەکەن، وە مەبەست بەم قسە ئەوەیە وەکو وایە بڵێی: ئایا ئێمە وەکو قسەی جادووگەر[2] قسە دەکەین تا خەڵکی لێی تێنەگات و وەپەندو ئامۆژگاری لێ وەرنەگرێت وەکو سورەتی (عبس).

---

- ئەگەر کەسێك چوو بۆ سەفەر ناوی بەدوادا هەڵ بپژێنە، بۆئەوەی زوو و وەبەسەلامەتی بگەڕێتەوە، وە ئەگەر بتەوێت ئەو کەسە نەگەڕێتەوە ئەوا گۆزەیەکی ڕەشی بەدوادا بشکێنە .

-لە مانگی سەفەردا، لەدە ڕۆژی کۆتاییدا ئەگەر لە چوارشەممە دا سەفەرێك بهاتایەتە پێشەوە، دەیان وت: کوڵە چوارشەممەیە!، شومە سەفەری تیادا بکەیت.

- ئەگەر کەسێك ویستی بچێت بۆ سەفەر یان ویستی کارێك بکات، لەو کاتەدا کە باسی سەفەرەکەی کرد، یان باسی ئەو کارەی کرد کە دەیەوێت بیکات، خۆی بپژمێت یان کەسێکی تر لەو ناوەدا بپژمێت، یەکسەر دەڵێن: سەبری هێنا!!، خێر بێت چاوەڕێ بکە جارێ مەچۆ، دەبێت سەفەرەکەی دواخات، خۆ ئەگەر دووجار بپژمێن ئەوا دەڵێن: خێرە شوکور!! بچۆ سەفەرەکەت یان کارەکەت بکە.

[1] بگەڕێرەوە بۆ پەرتووکی: (اقوالٌ وافعالٌ خاطئة)ی د.طلعت زهران لاپەڕە ٢٩.

[2] قسەی جادووگەر: بریتییە لە کۆمەڵە قسەیەك کە کوفرو شیرکییاتە بەرامبەر بە خوا، بۆ ڕازی کردنی شەیتان دەیانڵێت،کە بەشێوەی وورتە وورت و وە بەخێرایی دەم دەجوڵێنێ، وە وورتنەکەیشی تێکەڵ و پێکەڵە، بەشێوەیەك هەر کەسێك گوێی لێ بگرێت لێی حاڵی نابێت، واتە: وەکو بڵتە بڵت وایە.

وەئەم قسەیەش دروست نییە بووترێت. لەبەرئەوەی وەسف کردنی قورئانی پیرۆزە، بەوەی کە ئەم قورئانە کۆمەڵێ ووتەیە کە ڕوون و ئاشکرا نین و، وە خەڵکی لە ئایەتەکانی تێ ناگات.

کەچی خوای بەرزو بڵند لە قورئانەکەیدا ڕوونی کردۆتەوە کە ئەم قورئانە کۆمەڵێ ووتەن کە دەربڕێنراون بەزمانێکی عەرەبی ڕوون و ئاشکرایە.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ﴾ (القمر: ١٧). واتە: سوێند بێ ئێمە ئەم قورئانەمان ئاسان کردووە بۆ لەبەرکردن و تێگەیشتن، وە ووشەکانیمان ئاسان کردووە بۆ دەربڕین پێ کردنی، وە مانای ئایەتەکانیشمان ئاسان کردووە بۆ تێگەیشتن، پڕمان کردووە لە پەندو ئامۆژگاری، تا هەر کەسێك کە بیەوێت لێی بەهرەمەند ببێت، ئایا ئیتر کەسێك هەیە لەم قورئانە پەندو ئامۆژگاری و عیبرەتی لێ وەرنەگرێت.

وەدەفەرمووێت "جل جلاله": ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ (یونس: ٢) ، واتە: ئێمە قورئانمان بەزوبانی عەرەبی ناردووە بۆ سەر پێغەمبەرەکەمان، بەڵکو بەهۆی ئەم قورئانەوە ئێوە عەقڵ و بیرو هۆش پەیدابکەن.

وە هەروەهادەفەرموێت "سبحانه" ﴿كِتَٰبٌ فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ (فصلت: ٣) ، واتە: ئەم قورئانە پەڕاوێکی ئاسمانییە، ئایاتەکانی شیکراوەتەوە، ماناو مەبەستەکانی بەڕۆشنی و وە بەجوانی خراونەتە ڕوو، وە ڕوون و ئاشکران، بەزوبانی عەرەبی نێردراوەتە خوار بۆئەوەی لێ تێگەیشتنی ئاسان بێت، وە ووشەو ڕستەکانی ڕەوان و

شیرینن، بۆئەوانەی زاناو تێگەیشتوون لە ڕەوانی و پاراوی و بەلاغەی قورئان حاڵی دەبن.[1]

**٦٠- ئەم قسەیە "تەمەنی درێژی بۆ تۆ بەجێ هێشتبێ": البقیةُ في حیاتك[2][3]**

ئەم قسەیە کەسێك دەیڵێت کەسەرەخۆشی دەکات لە کەسێك کە خزمێکی نزیکی یا هاوڕێیەکی مردبێت، وە مەبەستی بەم قسەیە ئەوەیە: کە ئەو مردووە پێش ئەوەی کە کۆتایی هاتبێ بەئەجەلی مردووە، واتە: پێش ئەوەی تەمەنی خۆی تەواو بکات مردووە، وە ئەو کەسەی کە سەرەخۆشییەکە دەکات دەپاڕێتەوە لەخوای گەورە کە چەند لەتەمەنی ئەو کەسە مردووە ماوە بیخاتە سەر تەمەنی ئەم خزمە نزیکەی ئەم مردووە یان ئەم هاوڕێی مردووە.

وە بێگومان ئەم قسەیەش قسەیەکی هەڵەیە، وە بیروباوەڕێکی پوچ و ناڕاستە، لەبەرئەوەی هیچ کەسێ نامرێت پێش کۆتایی نەهاتنی ئەجەل و تەمەنی.

---

[1] ئەم قسەیە نییە لەناو خەڵکی ئێمەدا، بەلاّم زۆر بەداخەوە قسەیەکی تر هەیە کە بەڕاستی هەر کەسێك خۆی بەمرۆڤ بزانێت قەت شتی وا ناڵێت، ئەویش ئەوەیە:
- ئەگەر کەسێك بانگی فەرموو یاخود قورئانی خوێندەوە و بەلاّم دەنگی ناخۆش بوو، خەڵکانێکی زۆر نەفام و گێل بەو کەسە دەڵێن: گوێ گرە بزانە چ هۆڕە هۆڕێکی ناوەتەوە، یان دەڵێن: ئەڵێی میز بەتەنەکەدا دەکات.

[2] البقیةُ في حَیاتِكَ، واتە: باقی تەمەنی ئەو مردووە بۆ تۆ بێ، یان چەند لەتەمەنی ئەو مردووە ماوە بچێتە سەر تەمەن و ژیانی تۆ.

[3] بگەڕێرەوە بۆ پەرتووکی (اقوال وافعال خاطئة) ی" زهران" لاپەڕە (٢٩).

خــوای گــەورە دەفــەرموویّت: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ﴾ (الاعـراف: ٣٤). واتــە: هــەموو مرۆڤێك و گەل و نەتەوەیەك كاتێكی تایبەت بۆ وەختی مردنیان دیاری كراوە، جا ئەگەر ئەو كاتەی خۆی هات، ئیتر بەهیچ شێوەیەك ساتە وەختێ دوا ناخرێ و وە ساتە وەختێكیش پێش ناخرێ.

وە "ابـی اُمامـة"- ڕەزای خـوای لێ بێـت -فەرموودەیـەكی گێڕاوەتـەوە كـە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویـەتی: (إنّ روح القدس نفث في رَوعي، أنّ نفساً لن تموت حتى تستكمل أجلها، وتستوعب رزقها، فاتقوا الله، وأجملـوا في الطلـب، ولايحملنّ احدُكم استبطاء الرزق أن يطلبه بمعصية الله، فإن الله تعالى لاينـال مـا عنده الاّ بطاعته)[1]، واتـە: بەڕاستی "جبریل" خستویەتیە نـاو هەست و دەروونمەوە، كەوا هیچ نەفسێك نامرێت هەتا ئەجەل و تەمەنی خۆی تەواو نەكات، وە هەتا هەموو ڕزقی خۆیشی نەخوات نامرێت، لەخوا بترسن!! بەشوێن ڕزقی حەلاڵ و پاكدا بگەڕێن، با هیچ كەسێك لە ئێوە سست بوون و دواكەوتنی ڕزق وای لێ نەكات، ئەو ڕزقەی لە ڕێگەی سەرپێچی كردنی خوداوە بەدەست بهێنێ، چونكە بەڕاستی ئەوەی لای خوای پەروەردگارە بەدەست ناهێنرێت ئیللا بەگوێڕایەڵی كردنی خودا نەبێت.[2]

---

[1] حدیثٌ صحیح: رواه ابو نعیم لـە "الحلیة"دا، و شێخ ئەلبانیش بەصەحیحی داناوە لە (صحیح الجامع) دا بەژمارە (٢٥٨٥).

[2] ئەم قسەیە زۆر بڵاوە لەناو عەرەبدا، كە كەسێك بمرێت بەخاوەنی مردووەكە دەڵێن: باقی تەمەنی ئەو مردووە بۆ ئێوە بێت!!، یان خوا تەمەنتان درێژ بكات بەتەمەنی ئەم مردووە. بەداخەوە هەر هەمان ئەم قسەیەش لەناو خەڵكی ئێمەشدا هەیە، بەڵكو بەزیاترەوە، وەكو:

## ٦١- ئەم قسەیە "خوا ئەو كەسەی بیر كەوتۆتەوە" : رَبُنا افتَكَرهُ

ئەم قسەیە هەندێ لە خەڵكی دەیڵێن،كە ئەگەر ویستیان هەواڵی مردنی كەسێك ڕابگەیەنن، وە ئەم قسەیە قسەیەكی بێ باوەڕی هەڵەیە، لەبەرئەوەی واتاكەی ئەوەیە: كە بەڕاستی ئەو كەسەی كە مردووە خوای گەورە بیری چۆتەوە،و پاشان خوای گەورە بیری كەوتۆتەوە كە ئەو كەسە هەیە ئەمجا مراندویەتی.

بەڵام خوای بەرزو بڵند پاكە لە هەموو كەم و كورتییەك، وەكو خەوتن و لەبیرچونەوە و وە وێنەی ئەمانە، خوای گەورە دەفەرمووێت:﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا﴾ (مریم: ٦٤)، واتە: پەروەردگارەكەی تۆ. هەر كارێكی بوێت لەبیری ناچێت، وە لەو كاتەی كە بۆی دیاری كردووە دەیهێنێتە دی.

وەخوای گەورە و میهرەبان لەسەر زوبانی پێغەمبەر (موسى) علیه السلام دەفەرمووێت: ﴿لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى﴾، (طه :٥٢)، واتە: پەروەدگاری من هیچی لێ تێك ناچێت، وە هیچیشی لەبیر ناچێتەوە، وە هیچیشی لێ وون نابێت.[1]

---

- بەخاوەن مردووەكە دەڵێن: تەمەنی درێژی بۆ ئێوە بەجێهێشتبێت.
- یان دەردو بەڵاو ناخۆشی لەگەڵ خۆیدا بردبێت.
- یان ئەمە ئاخرین موسیبەت و دوا ناخۆشیتان بێت، ئیتر یاخوا بەخۆشیتانەوە بێین بۆماڵتان.
- یاخود دەڵێن: یاخوا چەند گڵ بەسەر ئەوەوەیە، ئەوەندە عومرت بێت.
- یاخود دەڵێن بە خاوەن تەعزییەكە:چاوی خێری لێتان بێت(واتە:مردووەكەیان) .

[1] لەناو خەڵكی ئێمەدا، ئەگەر ویستیان دڵخۆشی خاوەن تەعزییەیەك بدەنەوە، بە كۆمەڵێ وتەی پڕوپووچ دڵخۆشی دەدەنەوە، وەكو:

٦٢- قسەی هەندێ "یاربّ یاساتِر": واتە: ئەی پەروەردگار ئەی داپۆشەر.

ئەم قسەیەش هەڵەیە، لەبەرئەوەی دروست نییە وەسفی خوا بە "ساتر" بکرێت، لەبەر دوو هۆ:

١) ووشەی "ساتر" واتە: داپۆشەر، یەکێك نییە لە ناوەکانی خوای گەورە و سیفەتەکانی.

٢) الساتر: بریتییە لەبەربەستێك کەوا شت لەپشت خۆیەوە قەدەغە و گل دەداتەوە، وە دروست نییە ئەوە بەخوا بووترێت.

---

- هەندێك لەخەڵکی دەڵێن: خوا ئێوەی بیر کەوتۆتەوە کە مردووی لێ مراندون. یاخود دەڵێن: خەفەت مەخۆن خوای گەورە ئێوە بەسەر کردۆتەوە، وەکو وابێت خوای گەورە هیچ شتێکی لەوە باشتری نەبێت کەوا خەڵکی پێ بەسەر بکاتەوە ئیللا ئەوە نەبێت کە مردوویان لێ بمرێنێت.

- یان دەڵێن: سەبر بگرن!! تازە خوا بارەکەی لێناون، وەکو وابێ خوای گەورە ئەو خاوەن تەعزییەکەی کردبێت بە گوێ درێژ و باری لێنابن، کەچی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً﴾ (الاسراء: ٧٠)، واتە: بەڕاستی ئێمە ئادەم خویشی و وە نەوەکانیشیمان ڕێز لێناوە، وە هەڵمان گرتوون لەووشکانی دا بەهۆی ئەسپ و گوێ درێژو سەیارەوەو هەموو هۆکارەنی گواستنەوە، وە لەناو دەریاشدا هەڵمان گرتوون بەهۆی کەشتی و وەهەموو ئەو ئامێرانەی کەلە دەریاکاندا بەکاردەهێنرێن، وە ڕزق و ڕۆزیشمان داون لەهەموو بەروبوومێك کە پاك و بەتەمام بێت، وە هەروەها گەورەیی و ڕێزی مرۆڤمان داوە بەسەر زۆرینەی هەموو ئەو دروستکراوانەی کە خوای گەورە دروستی کردوون، یعنی: هەموو شتێك لەم بوونەوەردا خراوەتە خزمەتی مرۆڤەوە، نەك بەقسەی پڕوپیرێژن خوا مرۆڤی کردبێت بە گوێ درێژ و باری لێنابێت.

بەلاّم خوای بەرزو بلّند ناوی : " سِتِّيرٌ "ە نەك ساتر، ئەویش بە بەلّگەی ئەو فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی: (اِنَّ اللهَ حيـيٌّ سِتِّيرٌ يُحِبُّ الحياءَ والسِتّرَ)[1]، واتە: خوای گەورە خاوەنی شەرمەو وە زۆر دەپۆشەرە، وە شەرمو داپۆشینیشی خۆش دەوێت.

٦٣- باوەڕبوون بەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) یەکەم دروست کراوی خوایە: (أوَّلُ خَلْقِ اللهِ).

ئەم قسەیە هەندێ لەبانگ بێژەکان دەیلّێن لەوەدا کە ناو دەبرێت بە (توا شیح) واتە: صەلاّکردن، کە ئەم (تواشیح)ە: بریتییە لە کۆمەلّێ هۆنراوە و قسەیەکی داهێنراو بیدعە،کە هەندێ لەبانگ بێژەکان پێش ووتنی بانگی بەیانی دەیلّێن، وە لەبارەی پێغەمبەرەوە دەلّێن: ( يـا أوَّلَ خَلْقِ اللهِ، وخـاتمَ رُسُـلِ اللهِ)[2]، واتە: ئەی یەکەم دروستکراوی خوا، ئەی کۆتا پێغەمبەری خوا.

وە ئەمەش قسەیەکی هەلّەیە، لەبەرئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) یەکەم دروستکراوی خوا نییە، وە بەلّگەش لەسەرئەوەی کە پێغەمبەر یەکەم دروستکراوی خوا نییە ئەو فەرموودەیەیە کە (عبادة کوڕی الصامت)

---

[1]حديثٌ صحيح: رواه( ابو داود) بەژمارە (٤٠١٢)، و(النسائي) بەژمارە (٤٠٧)، وە شێخ ئەلبانیش بەصحیحی داناوە لە (صحيح ابی داود) دا بەژمارە (٤٠١٢).

[2](خـاتم رسـل الله) هەلّـە نیـە، چـونکە پێغەمبـەر (ﷺ) ڕاسـتە کۆتـایی هـەموو پێغەمبەرانـە، بـەلاّم مەبەستی نووسـەر لـەوەی کـە هەلّەیـە ڕستەی (اولَ خلق الله)ی هەلّەیە بەپێغەمبەر (ﷺ) بوترێت، وە هەروەها هەردوو ڕستەی (یا خاتم رسل الله و یا اول خلق الله) دروست نییە لەپێش بانگی بەیانییەوە بووترێت، چونکە بیدعەیە ووتنیان لەو شوێنەدا.

-ڕەزای خوای لێ بێت- گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: گوێم لەپێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو: (إنَّ أوَّلَ ما خَلَقَ اللهُ، القلمُ، فقال له: أُكتُبْ. قال: ربِّ وماذا أكْتُبُ؟ قال: أُكتُبْ مقاديرَ كلِّ شيءٍ حتى تقوم الساعةُ) [٢]، واتە: یەکەم شتێك کە خوا دروستی کرد: قەڵەم بوو، خوای گەورە پێی فەرموو: بنووسە، قەڵەمەکەش وتی: ئەی پەروەردگارم چی بنووسم؟ خوای گەورە فەرمووی: بنووسە ئەندازەگیری هەموو شتیٚ هەتا هاتنی ڕۆژی قیامەت.[١]

---

[٢] حدیثٌ صحیح: رواه (ابو داود) بەژمارە (٤٧٠٠)، و(الترمذي) بەژمارە (٣٣١٩) وە فەرموویەتی ئەم فەرموودە: حسنٌ صحیحٌ غریبٌ، و ئەلبانیش بە صەحیحی داناوە لە "صحیح ابی داود" دا بەژمارە (٤٧٠٠).

[١] صلاْوات دان لەسەر پێغەمبەر کە پێی بڵێت (اول خلق الله) زۆرە لەناو خەڵکانی ئێمەشدا، بە بەڵگەی ئەوەی کە لەسەر مکابەرەی مزگەوتەکانەوە دەدرێت بەگوێی هەموو خەڵکیدا، یاخود ئەگەر بتەوێ گوێت لەم جۆرە وەسفانە بێت لەبارەی پێغەمبەرەوە، ئەوا (٥) دەقیقە پێش بانگی بەیانی هەستە لەخەوو گوێ بگرە ئەڵێی ڕۆژی حەشرە، لەهەموو مزگەوتەکانەوە دەنگ دێت وە هەر کەسە بەجۆرێ و وە هەر کەسە بەئاوازێك وەسفی دەکات، یاخود کەسانی وایان هەیە شیعرو هۆنراوەی ئەو شاعیرانەی کە لەبارەی پێغەمبەرەوە وتوویانە ئەوە دەکات بە صەلاْکردنەکەی، هەندێك لەو وەسفە ناشەرعیانە، وەکو:

- یاطبیبَ قلوبنا. واتە: ئەی پزیشکی دڵەکانمان.
- یا نور ابصارنا. واتە: ئەی نوور و تینی چاوەکانمان.
- یاخود لەکاتی بانگداندا، کە بانگ بێژ گەیشتە (اشهدُ أنَّ محمداً رسول الله)، خەڵکانێك هەردوو بەنجە گەورەی هەردوو دەستی دەلکێنێت بەیەکەوە و، وە هەردوو نینۆکی ئەو دوو پەنجەیەی ماچ دەکات و ئەمجا بەهەردوو چاوی دا دەیهێنێت لەم سەر بۆ ئەو سەر، بەگومانی ئەوەی دەڵێت: ئەگەر وابکەی لەدوای

## ٦٤- ئەی نوری عەرشی خودا: یا نـورَ عَـرشِ الله

ئەم قسەیە تاوتویٚ دەکریٚت و دەوتریٚت لەسەر زوبانی زۆرینەیەك لە خەڵکی کە بەپیٚغەمبەر (ﷺ) دەڵیٚن: (یانورَ عرش الله). کە ووتنی ئەم قسەیە دوو واتا هەڵدەگریٚ:

یەکەم: کە پیٚغەمبەر (ﷺ) دروست کراوە لەنوری عەرشی خوا، وە ئەم بۆچوونە بۆچوونێکی هەڵەیە، لەبەرئەوەی پیٚغەمبەر (ﷺ) مرۆڤەو، وە وەکو مرۆڤیش دروستکراوە، خوای گەورە دەفەرموویٚت: ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَاْ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ﴾ (الكهف: ١١٠)، واتە: ئەی پیٚغەمبەر پیٚیان بڵێ: تەنها منیش مرۆڤێکم وەکو ئیٚوە، خوای پەروەردگار نیگام بۆ دەکا و وەکردوومی بە پیٚغەمبەر.

دووەم: یاخود ئەگەر مەبەست بەم قسە ئەوە بیٚت، کە پیٚغەمبەر (ﷺ) سەرچاوەو چاووگ و کرۆکی نوری عەرشە، ئەوا ئەمەش دووبارە باطیل و پووچ و ناڕاستە، لەبەرئەوەی خوای گەورە خۆی دەفەرمووێ: ﴿ٱللَّهُ

---

(اشهدُ ان محمداً رسول الله)دا ئەوا قەت تووشی چاو نیٚشە نابیت، یا درەنگ لەپیریدا چاوت کز دەبیٚت.

بەڵام ئەگەر ڕاستیمان بویٚت پیٚغەمبەری خوا بەهیچ وەسفیٚك لەم وەسفانە ڕازی نییە، بەڵکو فەرموویەتی: وەسفی من بکە بە (عبدُ الله و رسولُ الله)، واتە: بەندەی خواو پیٚغەمبەری خوا، ئەمەش بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی کە ئیمامی بوخاری گێڕاویەتییەوە کە پیٚغەمبەری خوا فەرموویەتی: (لاتطروني كما اطرت النصارى ابن مريم، فإنما انا عبدٌ، فقولوا: عبدُ الله و رسولهُ)، واتە: هەڵم مەنیٚن و زیادەڕەوی مەکەن لەبارەمەوە، وەکو چۆن گاورەکان زیادەڕەوییان کردن لەبارەی کوڕەکەی مەریمەوە، بەڵکو بە تەنها بەمن بڵیٚن و وەسفم بکەن بە (عبدالله و رسوله)، واتە: بەندەو پیٚغەمبەری خوا.

نُورُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ (النـور: ٣٥)، واتــه: (الله) خــۆی نــورو ڕۆشنایی ئاسمانەکان و زەوییە.[1]

---

[1] ئەو خەڵکانەی کە بەپێغەمبەر دەڵێن: نوری عەرشی خودا چەند کەسێکی دیاری کراو نین، یاخود بەتەنها لەیەك وولاتدا نین، بەڵکو خەڵکانێکی زۆر ئەمە بووە بەباوەڕیان، بەتایبەتی ئەو کەسانەی کە بیروباوەڕی سۆفیگەرێتیان هەیە، بەتایبەت تریش ئەم جۆرە قسەنا بیروباوەڕی زاناکانیانن، کە بانگەشەیشی بۆ دەکەن لەکتێب و ووتارەکانیاندا، وە زمانی خەڵکی لەسەر ڕادەهێنن و وەسەری خەڵکی پێوە گەرم دەکەن، وە سەرچاوەی دەرهێنان و دروستکردنی ئەم قسانەش کۆمەڵێك قسەی ناڕاست و درۆینەن، کە دەڵێن: ئەمانە فەرموودەی پێغەمبەرن، و وەکردویانە بە بەڵگە بۆ چەسپاندنی ئەم جۆرە قسانە لەبارەی پێغەمبەرەوە، کە هیچ کامێك لەو قسانە ڕاست نین و وە هیچیان فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) نین، بەڵکو کۆمەڵێ قسەی درۆینەن و بۆ پێغەمبەریان دروست کردووە، هەندێ لەو بەناو فەرموودانە:

- (اولُ ما خلقَ اللهُ نورَ نبيك ياجابر)، واتە: یەکەم شتێك کە خوا دروستی کرد، نوری پێغەمبەرەکەی تۆ بووە ئەی جابر.

- (اِن الله قبض قبضةً من نوره فقال لها: كوني محمداً)، واتە: بەڕاستی خوای گەورە جنگێکێ لەنوری خودی خۆی گرتوو، ئەمجا بەو نورەی فەرموو: ئەی نورەکە ببە بەمحمد.

- یاخود یەکێك لە زانا سۆفییەکان لەکتێبی (زیکری ئێواران و بەیانیان)دا کە دانراوی خۆیەتی، ئاوا صلاوات لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) دەدات: (اللهُمَ صَلِّ على محمد الذي خلقتَ من نوره كل شيء)، واتە: خودایە درووود و سلاو بریژی بەسەر ئەو (محمد)ەی، کەوا دروستت کردووە لەنووری ئەو محمدە هەموو شتێك، یعنی لەلای ئائەمە کە پێی دەوترێت زانا لەناو ئەواندا، هەموو شتێك خوت لە نوری پێغەمبەر (ﷺ) دروستی کردووە، هەموو شتێکیش وەکو: (زەوی ،و ئاسمان، و ئاو، و هەوا،و مرۆڤ، و جنۆکە،و دار،و بەرد،و هەموو حەیوانات و، هەموو پەڵەوەرو، ماسی و..... هەتا کۆتایی)، دەی خۆ هەموو شتێ شەیتان و بەرازو

## ٦٥- ئەم قسە "رَبُنا موجود"[1] : پەروەردگارمان مەوجودە

ئـەم قـسەیە هەنـدێ لەخـەڵکی دەیڵێـت، وە لەگـەڵ ووتنەکەشـیدا بـێ ئاگایشن لەواتاکەی، چونکە هیچ دروست کراوێك نییە ئیللا خالقێك و دروست کەرێکی هەیە، وە هیچ شتێك نییە کە هەبێت و هێنرابێتە بوو

---

مەیمونیش دەگرێتەوە، چونکە شەیتان و بەرازیش یەکێکن لە شتەکان، دەی تو خوا دەگونجێ لەنوری پێغەمبەر (ﷺ) خراپە کارێکی وەکو شەیتان دروست کرابێت، یاخود ئـاژەڵێکی پیـسی وەکـو بـەراز دروسـت کرابێـت، دەگـونجێ ئـاوا وەسـفی بەرێزترین مرۆڤـ بکەین کە پێغەمبەری خوایە (ﷺ).

- یاخود دەڵێن: کاتێك کە خوا ئادەمی دروست کرد، ئادەم سـەری هـەڵبڕی سەیری عەرشـی خـوا بکـات، لـەلای عەرشـی خـواوە نـوورێکی پرشـنگداری بینـی، ئـادەم فەرمووی: خوایە ئەو نورە چییە؟ پێیان ووت ئەوە: نوری "محمدولمصطفی" یە.

بەقسەی ئەمان نوری پێغەمبەر لەپێش ئادەمیشە دروست بووە، ئەمجا هـەر کەسێك عەقڵیەتی وەکو ئەوان وابێت و وەکو ئـەوان بیربکاتـەوە، ئـەم دۆرە ووەسفانەی بۆتـە بیروبـاوەڕی، وە لـەناو کوردیـشدا خـەڵکانێکی زۆر هەیـە، هـەر هـەمان ئـەم بـیرو باوەڕەیان هەیەو، وەهەر هەمان ئەم قسانە دەکـەن لـەبارەی پێغەمبـەرەوە (ﷺ)، کـە بەداخەوە خۆیشیان زۆر بەتێگەیشتوو دەزانن لەدینـدا، وە هـەر خۆشیان بەڕاست دەزانن، وە غەیری خۆیان بەگومڕا دەزانن.

یاخود درۆیەکی تریان دروست کردووە و ناویان لێناوە فەرموودەی قودسی، کەوا خوا بەپێغەمبەری فەرمووە (لولا لولا ما خلقت افلاك)، واتە: ئەگـەر لەبـەر خـاتری تۆ نەبووایە،ئەگەرلە بەر خاتری تۆ نەبووایە، من ئەم بوونەوەرەم دروست نەدەکرد.

[1] کە دەوترێت (خـوا موجـود)ە: مەبەسـتیان ئەوەیـە کە خـوا هەیـە، بەڵام ووشـەی (موجود) واتاکەی (هەیە) نییە، وە هەر کەسێ بڵێ (خوا موجـود)ە گوناهـی دەکـات، چـونکە ووشـەی (موجـود) واتـە: یـەکێکی تـر خـوای هێناوەتـە بـوون و دروسـتی کـردووە، دەی شـتی وا چـۆن لەگـەڵ "الله" دا دەگـونجێ، کـە تـەنها خـۆی خودایـە و تەنها خۆیشی بەدیهێنەرو دروستکەرە.

ئـیللا یـەکێك هەیـە هێناویەتیـە بـوو، دەی خـوای بـەرزو بڵنـد، نـاوی (واجِد)ە، واتـە: ذاتێکە هـەموو شتێك دێنێتـە بوون، بەڵام نـاوی (موجـود) نییە، واتە: ذاتێك بێت و هێنابێتیانە بوون.

## ٦٦- ئەم قسەیە" رَبُّنا في كلِّ مكان" : واتـە: خوا لەهەموو شوێنێکە

ئەم دەستەواژەیە ڕاستە، بەڵام بە مەرجێ ئەو کەسەی کە ئەم قسە دەکات مەبەستی بەم قسە ئەوەبێت: کە خوای گەورە لە هەموو شوێنێکە بەعیلم و زانست و بەئاگابوونی بەهەموو دروست کراوەکانی و، وە دەورەدانی خوا بۆ هەموو شتێك و، وە زاڵ بوون و دەسەلأتی خوا بەسەر هەموو شتێکدا، هەروەکو چۆن خوای گەورە دەفەموویێت: ﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ﴾، واتە: ئایا ئەی مرۆڤـ نابینی کە خودا زانایەو بەئاگایە بەسەر هەموو شتێکدا کە لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە و وە کە ڕوو دەدات، بەشێوەیەکی واها پەروەردگار بەئاگایە ﴿مَا يَكُونُ مِن نَّجۡوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمۡ﴾ لە هەر شوێنێك سێ کەس بەیەکەوە سرتەو چرپەیەك بکەن ئیللا خودا بەزانین و عیلم و زانیاری خۆی لەگەڵیاندا چوارەمینە، وە ئاگای لێیانە و ئاگای لەوەیە کە دەیڵێن، یاخود ﴿وَلَا خَمۡسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمۡ﴾ هەر چرپەیەك لەنێوان پێنج کەسدا بکرێت ئیللا خودا بەزانستی خۆی لەگەڵیاندا شەشەمیانە، ئاگای لێیانە کەچی دەڵێن و وەبڕیار لەسەر چی دەدەن، وە ئاگای لە هەموو هەست و نەستێکیانە و سرتەو ورتەیان دەبیستێت، بەهەمان شێوە ﴿ وَلَآ أَدۡنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكۡثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمۡ أَيۡنَ مَا كَانُواْۖ ﴾ وە بەئاگایە ئەگەر چرپەکان لەچرپەو ورتەش کەمتر بن، یان زیاتر بن ئیللا خوای گەورە هەر پێی

دەزانێت، یاخود ئەو کەسانەی کە چرپە دەکەن لەنێوان خۆیاندا لەپێنج کەس کەمتریش بن یاخود زیاتریش بن، وە لەهەر جێگاو شوێنێکدا بن ئیللا خودا بەزانینی خۆی لەگەڵیاندا دەبێت، ﴿ثُمَّ﴾ پاشان ﴿ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾(المجادلة :٧).

واتە: لەڕۆژی دواییدا ئەوەی کە کردوویانە و وە کەوتوویانە و بڕیاریان لەسەرداوە دەریدەخات و ئاشکرای دەکات بۆیان و دەیخاتەوە بیریان، بەڕاستی خودا زانیارو بەئاگایە بەسەر هەموو شتێکدا.

وە ئەم لەگەڵ بوونی خواییە لەگەڵ دروست کراوەکانی لەگەڵ بوونێکی(**العلم و الاحاطة**)یە، واتە: خوا لەگەڵیانە بەزانست و دەورەدان و بەئاگابوونی بۆ هەموو مخلوق و دروستکراوەکانی، نەك بە لەگەڵ بوونی خوایی بەذاتی و خودی خۆی بێت، لەبەرئەوەی کە ئایاتەکە باسی لەگەڵ بوونی خوایی دەکات بە عیلم دەست پێدەکات، کە دەفەرمووێ ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ﴾، واتە: ئایا نابینن کە خودا زانیاری هەیە، وە هەر بەعیلمیش کۆتایی هاتووە ئایەتەکە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾، واتە: بەڕاستی خودا بەسەر هەموو شتێکدا زانایەو زانیاری هەیە.

بەڵام ئەم قسەیەی کە دەوترێت "خوا لەهەموو شوێنێکە" ئەگەر مەبەست پێی: (**معيةُ الذات**)[1] بێت، واتە: لەگەڵ بوونی خوایی بە زاتی وخودی خۆی بێت لەگەڵ دروست کراوەکانیدا، یەعنی بڵێی: الله

---

[1] (معيةُ الذات): ئەوەیە کە باوەڕت وابێ کە خودا خۆی بەذاتی لەگەڵت دایە، وە بۆ هەر شوێنێك بڕۆیت و بچیت، خواش لەگەڵت دێت و دەچێت، کە ئەوە لەگەڵ گەورەیی خودا ناگونجێ.

لەهەموو شوێنێکە بەذاتی وخودی خۆی، ئا ئەمەیان هەڵەیە، لەبەرئەوەی خوای گەورە خەبەرو هەواڵی لەخۆی داوە لە قورئانەکەیدا کە لەسەروی هەر حەوت تەبەقەی ئاسمانەکانەوەیە و بەسەر عەرشەوەیە، وەك دەفەمووێت: ﴿ٱلرَّحْمَـٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ﴾ (طه: ٥)، واتە: پەروەردگار لەسەروو عەرشەوەیە.

پاشان خوای گەورە لە سەروو عەرشەوەیە بەشێوەیەك کە شیاوی بەرزو بڵندی و دەسەڵات و گەورەیەتیەتی، کە ئێمە نایزانین چۆنە[1].

**٦٧- ئەم قسەیە "رَبِّ لا أسالك ردّ القضاءِ بل اسالك اللّطف فيه": واتە: خودایە داوات لێناکەم ئەوەی کە تۆ دەتەوێت جێبەجێ بکەی بیگێڕێتەوە و ئەنجامی نەدەی، بەڵکو داوای بەزەیت لێ دەکەم تیایدا.**

ئەم قسەیە هەندێ لەخەڵکی دەیڵێت، کە قسەیەکی ناڕاست و هەڵەیە، چونکە دروستە کە بپاڕێیتەوە و داوا لە خوای گەورە بکەی کە ئەو قەزاو قەدەرەی ئەگەر خێر نەبێت بیگێڕێتەوە و دووری بخاتەوە لێت.

وە پاشان ئیمامی "ابن ماجە" فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە لە (ثوبان)ەوە- ڕەزای خوای لێ بێت- کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لا يَزيدُ في العُمرِ الاّ البرُّ، ولايَردُ القضاءَ الاّ الدّعاءُ)[2]،

---

[1] ئەم هەڵەیەش هەیە لەناو خەڵکانی ئێمەدا: بەتایبەتی لەناو ئەو کەسانەدا کە بیروباوەڕی (ئەشعەری) یان هەیە، وە زۆرینەی خەڵکی ئێمە لەسەر ئەو بیروباوەڕە پەروەردە کراوە و، وەبووە بەبیروباوەڕیان کە پرسیاریان لێ بکەی: ئایا خوا لە کوێیە؟ دەڵێت: خوا لەهەموو شوێنێکە.

[2] حديثٌ حسن: رواه (احمد) بەژمارە (٢١٨٨١)، و(ابن ماجە) بەژمارە (٩٠)، و حسنه الالباني لە (الصحيحة)دا بەژمارە (١٥٤).

واتە: زیاد ناکات لەتەمەنی مرۆڤ ئیللا کردەوەی چاکە نەبێ، وە قەزاو قەدەریش ناگێڕێتەوە ئیللا پاڕانەوە و دوعا نەبێ.

وە هاتووە لەو دوعایەدا کە پێغەمبەر (ﷺ) فێری (حەسەن) یاخود (حسێن) ی کردووە، هەتاوەکو بەم دوعایە بپارێنەوە لەخوا لە "قنوت" دا، کە فەرموودەیەتی (ﷺ): (......وَقِنا واصرف عنّا شرَّما قضيْتَ)، واتە: ..... وەبمان پارێزەو وە لێمانی دوور بخەرەوە، ئەی پەروەردگار! ئەو شەڕەی کە تۆ بڕیارت داوە کە ئێمەی پێ تاقی بکەیتەوە. وە ئەم دوعایە لە نوێژدا لە کاتی دوعای قنوت خوێندندا دەوترێت.

**٦٨- ئەم قسەیە " أنا عبدُ المامور "[١]: من بەندەی ئەو زاتەم کە فەرمان پێکراوە .**

ئەم دەستەواژەیەش کەسێ دووبارەی دەکاتەوە و دەیڵێت کە بیەوێت فەرمانی سەرکردەکەی، یاخود فەرمانی بەڕێوەبەری ئیشەکەی جێبەجێ بکات.

کە ئەم دەستەوەژایە دەستەواژەیەکی هەڵەیە، بەڵکو تۆ بەندی خوایەکی کە (**العزيزُ و الغفور**)ە، واتە: خوایەکی دەسەڵاتدارو لێ بووردەیە، وە خوای گەورەش دەفەرمووێت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ (الذاريات :٥٦)، واتە: من (پەروەردگار) ئادەمیزادو جنۆکەکانم بۆیە دروست کردووە، تەنها بۆئەوەی بم پەرستن، وە بەگوێرەی فەرمانەکانم ژیان ببەنە سەر.

---

[١] کەی خوا فەرمانی بەسەردا دەکرێت، بەڵکو فەرمان دەکات.

وە دووبـارە دەفـەرموویت: ﴿وَكُلُّهُمْ ءَاتِيهِ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَرْدًا﴾ (مـريم :٩٥)، واتـە: هـەموو یـەکێك لـە بەنـدەکانی لـەڕۆژی قیامەتـدا، دێتـە خزمـەتی پەروەردگار بەبێ کەس و بەتەنها و بێ یارمەتیدەر.

## ٦٩- پەسـەند کـردن و بەباشـتر زانینـی ڕێنمـوایی کـافران بەسـەر ڕێنموایی موسڵمانانـدا:

لـەناو خەڵکیـدا کەسـانێکی وا هەیـە ڕێنمـویی کافرەکـان بەباشـتر دەزانێـت لـەنان خـواردن دا: لـەوەدا کـە نـان دەخـوات لەسـەر سـفرە و خوانی بەرزو لەسەرمێز دەخوات، یاخود بەدەستی چەپی خواردنەکەی دەبات بۆ دەمی، وە بەدەستی ڕاستیشی چەقۆ دەگرێت، بـەلأم ثـابیت و جێگیر بووە کە پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر هیچ شتێکی بـەرز هـەرگیز نـانی نـەخواردووە، کـە پێـی دەوترێـت (خـوان یـاخود مائـدة)[1]، بـەڵکو تـەنها پێغەمبەر (ﷺ) لەسـەر سـفرەی ڕاخـراو لەسـەر زەوی نـانی دەخـوارد کـە ناو دەبرێت بە (السفرة).

ئەنەس- ڕەزای خوای لێ بێت- دەفەرمووێ: (ما اكلَ رسولُ اللهِ (ﷺ) على خـوانٍ قـط)[2]، واتـە: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) هـەرگیز نـانی نـەخواردووە لەسەر خوان (سفرەی بەرز).

وە ووشەی (الخوانُ): بریتییە لەو سفرەی کە بەرز بووبێتەوە لەزەوی.

---

[1] خوان و مائدة: لە کوردیدا پێی دەوترێ:( سفرەو خوان)، کە بریتییـە لـەو سفرەی کە لەسەر شوێنێك، یان لەسەر شتێکی بەرز دادەخرێت و وە خواردنەکەی لەسەر دادەنرێت، کە ئێستا ئەم جۆرە نان خواردنە لەسەر مێز دەخورێت، وە بە چواردەوری مێزەکەدا کورسی دادەنرێت.

[2] حديث صحيح: رواه البخاري بەژمارە (٥٣٨٦).

دووباره ئیمامی بوخاری فەرمودەیەکی گێڕاوەتەوە کە: ووتراوە بە (قەتادە): (فَعَلام كانوا ياكلون؟ قال: على السُفَرِ)، واتە: ئەی لەسەر چی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی نانیان دەخوارد؟ فەرمووی:لەسەر سفرە.
وە ووشەی (السفرةُ): بریتییە لەو چەرمەی کە دادەخرێت لەسەر زەوی و خواردنەکەی لەسەر دادەنرێت. ئەوە قسە لەسەر سفرە، ئەمجا قسە لەسەر نان خواردن بەدەستی ڕاست و، وە بە نەخواردنی بەدەستی چەپ، هاتووە لە "صەحیحی موسلیم"دا کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (إذا أكلَ احدُكم فليأكلْ بيمينه، وإذا شَرِبَ فلْيشرب بيمينه، فإنَّ الشيطان يأكل بشماله ويشرب بشماله)[1]، واتە: ئەگەر یەکێ لەئێوە نانی خوارد بابەدەستی ڕاستی بیخوات، وە ئەگەر شتێکیشی خواردەوە با هەر بەدەستی ڕاستی بیخواتەوە، چونکە* شەیتان دەخوات بەدەستی چەپی وە دەش خواتەوە بەدەستی چەپی .
وە هەندێکی وا هەیە ڕێنموایی کافرەکان بەباشتر دەزانێ لەجل و بەرگی دا:
وەکو: بەکارهێنانی شەبقەی یەهودی، وە لەبەرکردنی جل و بەرگی ئەورووپی بۆ پیاوان، و مۆدیلاتی جلی ئافرەتە کافرە غەریبەکان، و وە وێنەی ئەمانە.

---

[1] حديثٌ صحيح: رواه مسلم بەژمارە (٢٠٢٠).

* تێبینی: ئەوەی ئاشکرایە کە نان خواردن لەسەرمێز دروستە و حەڵاڵە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) نەیفەرمووە: نان مەخۆن لەسەرمێز، کەواتە مادەم پێغەمبەر هیچی لەبارەوە نەفەرمووە و نەهیشی لێ نەکردووە، کەواتە هیچی تیا نییە ئەگەر لەسەر مێز نان بخورێت، بەڵام کاتێك حرامە ئەگەر تۆ بەباشتری بزانی نان خواردن لەسەرمێز وەك لەسەر سفرە، لەبەرئەوەی ئەورووپییەکان لەسەر مێز نان دەخۆن، ئا لەم کاتەدا، بەڵێ حەرامە چونکە خۆشوبهاندنە بەکافرانەوە.

**وه هەندێکی تری وا هەیە ڕێنموایی کافرەکان بەباشتر دەزانێ لەقسەکردندا:**

لەبری ئەوەی کە بڵێ: سفر، دەڵێ: زیرۆ بە(ئینگلیزی).

وە لەبری ئەوەی بڵێ: بەڵێ، دەڵێ: ئۆکەی.

وە هەروەها لەجیاتی ئەوەی کە بڵێ: بەسەلامەتی بڕۆی (مع السلامة) یان خواحافیز، دەڵێ: بای بای .

**وە هەندێکی تر ڕێنموایی کافرەکان بەباشتر دەزانێ لە ناونانی کارگەو دوکانەکاندا:**

لەپێشی دوکانەکەی یان کارگەکەیدا، ناوی ئەوروپای (ئینگلیزی یاخود فەرەنسی) بەخەتێکی گەورە لێ دەنووسێت، وە ئەو ناوانەی کە لە زمانەکەی خۆیدا هەیە وازی لێ دەهێنێ، وە ئەمە تێکشان و شکستێکی دەروونییە، وە هەست کردنە بەلاوازی، و گرێ پووچەکەو کۆسپی چاولێکەری کوێرانەی کەسە لاوازەکانە بۆ بەهێزەکان، خوای گەورەش دەفەرمووێ: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ﴾ (المنافقون: ٨)، واتە: هەر تەنها بۆ خودایە شکۆمەندی و بەهێزی و بالادەستی، وە بۆ پێغەمبەرەکەیەتی و، وە بۆ موسوڵمانانیشە.[١]

---

[١] بەباشتر زانین و خۆشوبهاندن بەکافرانەوە، لای ئێمە:

١- شوبهاندنی منداڵانمان بەمنداڵانی کافرانەوە:

- هەر لەسەرەتاوە فێری ووشەی "بای بای" دەکەن، و زمانی بەم ووشەیە دەپژێت.
- قژی لەسەر شێوازی ئەورووپی بۆ دەبڕن، یاخود بۆی حەفر دەکەن، یاخود بۆی دەتاشن وەکو شێوەی یاریچی یە بەرازیلییەکان.

– جلی ڕووت و کورتی لەبەر دەکەن، هەر لەمنالّییەوە لەسەر ئەم ڕووتییە ڕای دەهێنن.
– فێری ڕەقص و گۆرانی نا شەرعی بیٚ کەڵك دەکرێت لەڕێگەی شریتی سیدییەوە.
٢– خۆشوبهاندن لەناو کچە گەنجەکاندا:
– سفورییەکی بیٚ سنوور و سوراو سپیاوێکی زۆر و بیٚ وێنە دەکرێت.
– لەبەرکردنی جلی ڕووت و کورت بەگوێرەی مۆدیلاتی سەتەلایت.
– لەپێکردنی پانتۆڵ، بەتایبەتی پانتۆڵی کاوبۆی تەسك و سیٚ چارەك.
– لە پیٚ کردنی پێلاّوی بنك بەرز، وەکو پێلاّوی ئافرەتانی ئەورووپی.
– برۆ هەڵگرتن و بڕینی قژیان ،وەکو مۆدیلاتی بێگانە.
– هێشتنەوە و درێژ کردنەوەی نینۆکی پەنجەکانیان.
– بەکارهێنانی ئامێرە کارەباییەکان بۆ کاری بیٚ کەڵك و گوناهباری وەکو: سەیرکردنی ئەفلامی بێکەڵك، وە سەیرکردنی گۆرانی ڤیدیۆ کلیپ، وە بەستنی پەیوەندی نادروست لەگەڵ جنسی بەرامبەردا.
– گۆڕین و تەجمیل کردنی دەموچاوو لوت بەرێگەی نەشتەرگەری.
٣– خۆشبوهاندن لەناو کوڕە گەنجەکاندا:
– بڕینی قژیان لەسەر شێوەی مۆدیلاتی ئەورووپی، وەکو فەرەنسی و حەفرکردن و، وە درێژ کردنەوەی قژیان تا نزیك ناو شانیان، یاخود لوول کردن و بەرزکردنەوەی پێش و دوای قژیان، یاخود لەشێوەی دەفتەری، یاخود بەرزکردنەوەی قژیان وەکو ئاگر.
– سمێل و ڕیش تاشین و هەڵگرتنی دەموچاو، ووە باریك کردنەوەی برۆیان، یاخود هێشتنەوەی ساکسۆن و قەنافزی نوك تیژو یان شێوە پۆستاڵی.
– لەپێکردنی قۆندەرەی پاژنە بەرزو نوك باریك.
– لەبەرکردنی پۆشاکی ناشیرین و بیٚ کەڵك، وەکو: لەبەرکردنی کراسی تەسك و کردنەوەی یەخەیان، یان لەبەرکردنی جۆرە بلوسێك کە ڕەسمی گۆرانیبێژی ئەورووپی تێدایە.
– لەمل کردنی زنجیری ئەستور و زنجیری باریك و لەدەست کردنی بازنە وەکو کچ.

## ٧٠- باوەڕبوون لەوەدا کە گسك دانی ماڵ بەشەودا فەقیری دەهێنێ بۆ ماڵ:

هەندێ لەخەڵکی باوەڕیان بەمە هەیە، هەرچەندە کە بیروباوەڕێکی پووچ و ناڕاستە، چونکە گسك دانی ماڵ بەڕۆژ بێت یان بەشەو هیچ پەیوەندییەکی بەدەوڵەمەندبوون و فەقیربوونەوە نییە. [1]

---

- لەپێکردنی پانتۆڵی کابۆی تەسك، یاخود خوارەکەی پان و درێژ لەژێر قاچیان دەخشێت، یاخود لەپێکردنی پانتۆڵی کابۆی سپی و بەڵەك بەڵەکی شین، وە جاری وا هەیە سەر ئەژنۆکانی دڕاون.

٤- خۆشوبهاندن لە(ناو)ناندا:

- یەکێك لە دەردەکانی ناو کۆمەڵگەکەمان، ئەوەیە کە ڕۆژ بەڕۆژ ئەم خۆشوبهاندنە لەزیادبووندایە، بۆنموونە:

- ناونانی منالّ بەناوی کەسانی بێ نرخ و هیچەوە، یان گۆڕینی ناو بۆ ئەو ناوانەی کە ناوی مرۆڤی خراپن.

- ناونانی کارگەو دوکان و چایخانە و هەتا کۆتایی، بەناوی بێگانەوە وەکو: مادۆناڵ و، پارکی فلان و، پالاس و، سوپەرمارکێت،و مینی مارکێت.

- یاخود خۆشوبهاندن بەکافرانەوە هەتتا لەشێوازی ئەنجامدانی کاری جنسی دا لەڕێگەی سەتەلایتەوە، کە بەشێوەیەکی لێ هاتووە ئەم خەڵکی ئێمە ئەگەر کافر بچێتە ناو کونی مار مێلکەوە ئەم خەڵکانەی ئێمەش دەچێتە ناو ئەو کونی مارمێلکەوە لەگەڵیاندا.

[1] پڕوپووچی لە"گسك" دان دا لای ئێمە:

- دەڵێن: لەدوای عەسرەوە نابێت گسك لەماڵ بدرێ!! چونکە دەڵێن: ڕزق و ڕۆزی لەدوای عەسرەوە دابەش دەکرێت، ئەگەر لەدوای عەسرەوە گسك بدەی، ئەوا بەگسکەکەت ڕزق و ڕۆزی لەماڵەکەت دەردەکەیت، بۆیە ئەگەر ماڵەکەیان پێویستی بەگسك دان هەبوو لەدوای عەسرەوە ناوێرن گسك بەکاربهێنن، بەڵکو بە پەڕۆیەك یان بە خاولییەك ماڵەکەیان گسك دەدەن.

## ٧١- دەورەگرتنی بـووك و زاوا: تحويطةُ الـعروسيـن

لەنێو خەڵکیدا کەسانێکی وا هەیە ئەگەر ویستی ژن بهێنێ، دەچێت بۆلای جادووگەرێ هەتا وەکو ئەم دەورە گرتنە (تحويطة)ی بۆ بکات، کە بریتییە: لە تاڵە دەزوویـیەك کە بەئەندازەی باڵای زاوا درێژە، وە لەگەڵ پارچەیەك لەنینۆك و،وە پارچەیەك لەقژی زاوایە کە جادووگەرەکە دەیخاتە ناو بەینی تاڵە دەزووەکەوە، پاشان کۆمەڵێك گرێ لەتاڵـە دەزووەکـە دەدات وە لەگەڵ هـەر گرێیەکـدا کـەلێی دەدات فوویەکیـشی پیـادا دەکـات، لەگـەڵ هـەر فووکردنێکیشدا کۆمەڵە ووشەیەکی شیرك بۆ خوا بڕیاردان دەڵێت، دوای ئەمانە تاڵە دەزووەکە دەهێنێ ووە کاغەزێکی تێوە ئەپێچێت و، وە کۆمەڵێ دەرزیش دەچەقێنێت بەکاغەزەکەدا، وە پاشان دەیدات بەزاواکە هەتا لـەو ڕۆژەدا کـە ژنەکـەی دەگوێزێتـەوە هـەڵیبگرێت لەگـەڵ خۆیـدا، هـەتاوەکو سیحری بەستنی لێ نەکرێت . بەڵام ئەم کارە سیحرو کوفرە کە دروست نییە بکرێت.[1]

---

- یاخود نابێت بەنێواراندا گسك بدرێت، بـۆ؟ چونکە خراپە!!.
- یاخود نابێت بەشەودا گسك بدرێت، بـۆ؟ چونکە نەهامەتییە!!.

[1] هەڵەی ژن هێنان لەناو خەڵکی ئێمەدا:-

ئەگـەر کـچێك شـووی کـرد یـاخود ئەگـەر کوڕێـك ژنـی هێنـا، دەبـێ لەگـەڵ بـوونی خۆشییەکەیدا، ترسـی ئەوەیشی هـەبێت کە سیحریان لێ نـەکرێت، کە بـەهۆی ئـەو سیـحرەوە تووشـی ناڕەحـەتی ببن، یـاخود تووشـی هەڵوەشـاندنەوە و فەشـەل ببن، دەبێت لای هەندێ لـە خـەڵکی هـەر لەسـەرەتاوە بووك یاخود زاوا چەند ڕێگایـەکی جۆراوجۆر بگرنە بەر بۆ خۆپاراستن لەسیحری بەستن و ڕەشـی، مەگـەر کەسێك کـە ترسی ئەمانەی نەبێت کە گوێ بەمانە نەدات، وەکو:

- دەبێت لەکاتێکدا کە جلی بووك دەبڕێت بۆ دروویـن، دەبێت بەدوا خەیاتێکدا بگەڕێن کەوا کەسێکی باش بێت، نەوەکو سیحری ڕەشی بکات بەجلەکانی بووکدا و وە لەدواییدا تەلاق بدرێت.

- یاخود بووك و زاوا لەخواردنی یەکێك نەخۆن کە یەکێك بێت لەکەسوکاری زاوا یاخود بووك،و وە ڕقی لێیان بێت، نەك سیحریان بۆ بکاتە ناو خواردنەوە و دەرخواردیان بدات، یاخود سیحریان بۆ بکاتە ناو ئاوەو پیایاندا هەڵپڕژێنێت لەکاتێکدا کە ئەمان بێ ئاگان لەو.

لەبەرئەوە بووك و زاوا ناچارن بەشوێن ڕێگەیەکدا بگەڕێن کە پارێزراو بن لەو سیحرو نارەحەتییانە، کە بەداخەوە ڕێگەی شەرعی ناگرنە بەر، بەڵکو ڕێگای ناشەرعی دەگرنەبەر، کە کەسی وایان هەیە دەچێت بۆلای ساحیرێکی تر بۆئەوەی کە ئەگەر سیحریان لێکرابێت پووچەڵی بکاتەوە بۆیان.

ئەو بیروباوەڕە پووچانە کە لەناو خەڵکیدا هەیە لەم بارەیەوە:-

١- پێش ئەوەی بووك بگوێزرێتەوە، ئەم پڕوپووچیانە هەیە لەناو خەڵکیدا:

- لای هەندێك لەخەڵکی، دەبێت جلی بووك لەڕۆژی جومعەدا نەبڕیەت، چونکە نەك لەبەریدا بسووتێت.

- ئەگەر جلیان نادر بۆ خەیاتەکە، دەبێت قوتووە نوقڵێکی تیادا بێت لەناو جلەکاندا، بۆئەوەی بووك لەلای مێردەکەی و ماڵە خەزوورانی شیرین بێت.

- دەبێت بووك لەشەوی گواستنەوەیدا نەچێتە دەرەوە، چونکە کە گوێزرایەوە منداڵی نابێت.

- دەبێت شەوی گواستنەوەکەی دەست و قاچی شل بکەن لەخەنەدا، ئەگینا وانەکەن بۆ بووك خراپە.

- یاخود لەو کاتەی کە بووك مارە دەکرێت ،دەبێت ئەو کەسانەی کە لەماڵی بووك بۆ ئەو کۆڕی مارە کردنە ئامادە دەبن، دەبێت هیچیان لەو کاتەدا بەنجەیان نەتەقێنن ، وە دەبێت هەر هەموو ئەو کەسانە لەو کاتەدا دەستیان بلاو بکەنەوە،بۆ؟ چونکە دەڵێن:دوایی دەبێت بە گرفت بۆ بووك وزاوا !!.

٢- لەڕۆژی گواستنەوەدا:

- دەبێت لەو ڕۆژانەدا بووك بگوێزرێتەوە كە پیرۆزن، وەكو ڕۆژی دووشەممە، یان چوار شەممە، یان ڕۆژی پێنج شەممە،چونكە دەڵێن: نابێت هەرگیز لەڕۆژی شەممەدا بیگوێزنەوە، چونكە لەو ئافرەتە پەشیمان دەبنەوە، و وەكارەكە هەڵدەوەشێتەوە و ئەو بووكە ناگوێزرێتەوە، چونكە ڕۆژی شەممە ڕۆژی ئیش و كاركردنە تیایدا نەك بووك گوێزانەوە، بەڵكو دەڵێن: لە ڕۆژی شەممەدا بووك لەسەر زین دەگەڕێتەوە.

- لای هەندێك لەخەڵك دەبێت تا ئەو ڕۆژەی كە بووك دەگوێزنەوە یەخەی كراسی بووك بەمقەست نابێت بكرێتەوە، بەڵكو دەبێت لەو ڕۆژەی كە دەگوێزرێتەوە كراسەكەی وەكو تورەكە بیكەن بەسەری بووكدا، ئەمجا یەخەكەی بەمقەست بكەنەوە.

- ئەمجا كە بووك ڕۆیی ئاوی بەدوا هەڵ بپژێنن، بۆئەوەی ڕووناكی لەدوای خۆی بەجێ بهێڵێت.

- وە كە گواستیانەوە دەبێت شت و كەلوپەل و جیازی باشی لەگەڵدا بنێرن، با خەڵكی بڵێن ماڵی باوكی بوكێ شتی زۆریان لەگەڵدا ناردووە.

- دەبێت كاسە نوقڵ بخەنە ناو جلی بووكەوە، بۆئەوەی شیرین بێت بووكەخان لای مێردەكەی.

- دەبێت ناو پێڵاوی بووك پارەی تێبكرێت، تا سەربە ڕزق بێت، وە ڕزق و ڕۆزی بۆ ئەو ماڵە بهێنێت.

٣- ئەمجا دوای گواستنەوە:

- دەبێت ئەو بووكە كە گواسترایەوە هەمیشە دڵی لەمشتیدا بێت، نەك مردوویەك لەماڵی خەزوورانی، یان خزمی ماڵە خەزوورانی بمرێت، ئەگین هەر ناڕەحەتییەك ڕوویدات یەكسەر ناوچاوانی بووك دەگرێتەوە، و پێی دەڵێن: پێی ڕەشە!! لەوەتەی ئا ئەمە هاتۆتە ناومان سەر قۆرت و كۆسپ كەوتووین و نەهاتووینەتەوە سەرخۆمان، یان دەڵێن: پێو قەیەمی بەخێر نەبوو.

- دەبێت بووك لای هەندێك لە خەڵك چای تاڵ زۆر شەكری تێ بكات، بۆئەوەی لای ماڵی خەزوورانی شیرین بێت.

- لای هەندێك دەبێت بووك كە میوانیان هات، ئەگەر بووكێ چای تاڵی برد بۆ میوانەكانیان دەبێت ئەو میوانە ئەو چا تاڵە هەر بخواتەوە و نەیگێڕێتەوە، ئەگین خراپە ئەو بووكە وەكو ئەو چایە تاڵ دەبێت لەبەرچاوی مێردەكەیدا.
- دەبێت تازە بووك هەمیشە ڕووە و ڕووناكی دابنیشێت، بۆئەوەی هەمیشە بووك ڕووناك بێت لەبەرچاوی خەڵكیدا.
- ئەگەر بووك نانی كرد هەویر بەدەستیەوە لكا، ئەوە ژنی بەسەردا دێت و، وەلەگەڵ ئەو ژنەدا گوزەرانی نابێت.
- دەبێت تازە بووك بۆ لای تازە بووك نەچێت تا چل ڕۆژ، خۆ ئەگەر چوون بۆ لای یەكتری دەبێت یەكی دەرزییەكیان پێبێت و لەگەڵ یەكترییدا بیگۆڕنەوە، ئەگین وانەكەن هەردووكیان تەڵاق دەدرێن.
٤- ئەمجا ژیانی لەگەڵ مێردەكەیدا:
ئافرەتی وا هەیە مێردەكەی خراپە بۆی، لێی دەدات، یان جنێوی پێ دەدات، یان خەڵكی بە مێردەكەی دەڵێن: ژنەكەت ناشیرینە، لەبەرئەوە بووكێ دەبێت هەزار ڕێگای بێ شەرعی بگرێتەبەر، بۆئەوەی مێردەكەی باش بێت لەگەڵیدا، وەكو:
- دەچێت نووشتەی چەوری و شیرینی لەمێردەكەی دەكات، تا شیرین بێت لەبەرچاوی مێردەكەیدا.
- دەبێت "هینە كەمتیارو مووروە كەرانە" هەر چۆن بێت وە بەهەر چەندە بێت پەیدای بكات، شەوان لەپشت و بەری پێی مێردەكەی هەڵبسوێت بەدزییەوە كە مێردەكەی خەوت، تا مێردەكەی بۆی كەر ببێت و خۆشی بوێت، ئەمجا لای ژنان مووروە كەرانە چۆن دەست دەكەوێت، ئەبێت بەشوێن كەرێكی تۆپیوی پیردا بگەڕێن، دەڵێن:لە ناوچاوانیدا شتێكی خڕ دەردەكەوێت، ئەوە مووروە كەرانەكەیە.
- ئەمجا ترسی ئەوەی هەبێت لەدوای ئەم هەموو شەڕەشەق و تێهەڵدانە بێوەژن نەكەوێت،خۆ ئەگەر مێردەكەی نەمرد و خۆی مرد، شتێكی سەیرتر هەیە لای هەندێك لەخەڵكی كە ئەوەیە: ئەگەر ئافرەتێك مرد، وە مێردەكەی ژنێكی تری هێنایەوە، ئەوا ئەو ڕۆژەی كە مێردەكەی ئەم ژنەی دووەمی گواستەوە، ئەوا لەو كاتەدا كە ئەو پیاوە ئەم ژنەی دووەمی گواستەوە، دوو كەسی خزمی ژنە

## ٧٢- پێ ناخۆش بوون بە لەدایك بوونی کچ: كراهيةُ انجابِ البنات.

هەندێ لە خەڵکی پێی ناخۆشە کە کچیان ببێت، وە ئەم پێناخۆش بوونەش هەڵەیە، لەبەرئەوەی پێویستە لە سەر ئەو کەسەی کە کچیان دەبێت کەوا باوەڕی بەقەزاو قەدەر ببێت، بەهیوای ئەوەی کە خوای گەورە ئەو کچانەی کە دەیبەخشێت بە هەر کەسێ بیانکات بەکۆمەڵە کچانێکی چاك و پاك، وە بەهۆی چاکەی ئەو کچانەوە سوودمەند ببێت ئەو کەسە لەژیانی دونیایدا، وە بۆیشی بپاڕێنەوە لەدوای مردنی.

پاشان سەرف کردنی پارە بۆ کچ، و وە بەخێوکردنی و سەرپەرشتی کردنی پاداشتەکەی گەورەیە و خێرگەیشتنەکەیشی زۆرە و فرەیە، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی کە دایکمان (عائشة)- ڕەزای خوای لێ بێت- گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( مَنْ ابتلى من هذه البناتِ بشيءٍ، فأحسنَ اليهنّ، كُنّ له ستراً من النار )[1]، واتە: هەر کەسێك کە خوای گەورە بەناڕەحەتییەکی ئەم کچانەی کە پێی دەبەخشێت تاقی

---

مردووەکەی دەچن لەسەر قەبری ئەم ژنە دەوەستن و وەهەر یەکەیان دوو تەنەکە ئاو بەدەستیانەوە دەگرن، لەو سەعاتەی کە ئەم مێردی ژنە مردووە ژنەکەی دووەمی گواستەوە، خزمی ئەم ژنە مردووە تەنەکە ئاوەکان دەکەن بەسەر قەبرەکەیدا، بۆ؟ چونکە دەڵێن: ئەم ژنە لەناو قەبرەکەیدا گڕی گرتووە لە خەفەتدا، با بەم ئاوە فێنکی ببێتەوە.

- بەڵام ڕێگەی شەرعی بۆ خۆپاراستن لەسیحرکردن لە بووك زاوا ئەوەیە: بووك و زاوا چەند ڕۆژێك پێش گواستنەوەکەیان لەبەیانی و ئێوارانەدا (١٠٠) جار بڵێن : (لا اله الا الله وحده لا شريك له، له الملك و له الحمد، يحيي ويُميت وهو على كل شيء قدير) انشاء الله پارێزراو دەبن لەو ناڕەحەتییانە.

[1] حديثٌ صحيح: رواه البخاري بەژمارە (١٤١٨)، و مسلم بەژمارە (٢٦٢٩).

کردەوە، وە لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کەسە چاك بوو بۆ ئەو کچانەی، ئەوا ئەم کچانەی دەبنە پەرژین بۆی و، وە لەئاگری دۆزەخ دەیپارێزن.

وە لەئەنەسەوە -ڕەزای خوای لێ بێت- فەرموودەیەك هاتووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مَنْ عالَ جاريتين، حتى تبلغا، جاءَ يومَ القيامةِ أنا وهو. وضَمَّ اصابعه)[1]،واتە: هەر کەسێك دوو کچ بەخێو بکات، هەتا دەگەنە تەمەنی باڵغ بوو، ئەوا ئەو کەسە دێت لەڕۆژی قیامەتدا، من و ئەو بەیەکەوە دەبین وەکو ئەو دوو پەنجەیەم، وە پێغەمبەر (ﷺ) هەردوو پەنجەی شەیەتومان و ئەوەی پاڵ بەیەکەوە نوساند.

وە لەڕیوایەتی ئیمامی(ترمذی) دا بەم شێوەیە هاتووە فەرموودەکە: (مَنْ عال جاريتين، دَخلتُ انا وهو الجنةَ كهاتين، واشار بأصبعيه)[2]، واتە: هەر کەسێك دوو کچ بەخێو بکات و پەروەردەیان بکات،ئەوا من و ئەو کەسە دەچینە بەهەشت بەیەکەوە وەکو ئەم دووانە، وە پێغەمبەر ئاماژەی بۆ هەردوو پەنجەی شەیەتومانی و پەنجەکەی پاڵ پەنجەی شایەتومانی کرد.

وە لە (ابن عباس)ەوە هاتووە -ڕەزای خوا لەخۆی و باوکی بێت- کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( مامِنْ مسلمٍ له ابنتان، فيحسنُ اليهما ما صحبتاه أو صحبهما الاّ ادخله الجنة)[3]، واتە: هەر موسوڵمانێك

---

[1] حديثٌ صحيح: رواه مسلم بەژمارە (٢٦٣١).

[2] حديثٌ صحيح: رواه الترمذي بەژمارە (١٩١٤) وحسنه، وە بەصەحیحی داناوە شێخ ئەلبانی لە (صحيح الترغيب) دا بەژمارە (١٩٧٠).

[3] حديثٌ حسن: رواه احمد بەژمارە (٢٣٥/١)، وابن ماجه بەژمارە (٣٦٧٠)، وابن حبّان بەژمارە (٢٩٤٥)، وحسنه الالباني له (صحيح الترغيب) دا بەژمارە (١٩٧١)، والارناؤوط لە (الاحسان) دا بەژمارە (٢٩٤٥).

دوو كچی هەبێت، وە چاكەیان لەگەڵدا بكات، هەتا ئەوەندەی ئەو دوو كچە لەگەڵ ئەمدا دەبن ، یاخود هەتا ئەوەندەی ئەم لەگەڵ ئەواندا دەبێت، ئەوا ئیللا پاداشتی ئەو كەسە ئەوەیە كە خوا دەیخاتە ناو بەهەشتەوە.

وە لە (ابی سعید الحذری)یەوە– ڕەزای خوای لێ بێت– فەرموودەیەك هاتووە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مَن كُنّ له ثلاث بناتٍ او ثلاث اخوات او بنتانِ او اختانِ فأدبهُنّ، واحسَنَ إليهنَّ وزوجهنَّ فله الجنة)[1]، واتە: هەر كەسێك سێ كچ یان سێ خوشكی هەبێت، یاخود دوو كچ یان دوو خوشكی هەبێت، بەجوانی ڕەوشتیان دابدات، وە چاكەشیان لەگەڵدا بكات، وە لەپاشە ڕۆیشدا بیاندات بەشوو، ئەوا ئەو كەسە بەهەشتی بۆ هەیە.[2]

---

[1] حدیثٌ صحیح: رواه( ابو داود) بەژمارە (٥١٤٧)، و(الترمذی) بەژمارە (١٩١٢)، وە بەصەحیحی داناوە ئەلبانی لە (صحیح الترغیب)دا بەژمارە (١٩٧٣)، وارناؤوط لە (الاحسان)دا بەژمارە (٤٤٦).

[2] **ڕق لێ بوونەوە لە كچ لای خەڵكی ئێمە:**

**١- پێش ئەوەی ئەو كچە لەدایك ببێت:**

– جارێ پێش ئەوەی ئەو منداڵە دەربكەوێت كە كوڕە یاخود كچ، دێن ژنانی لا كۆڵان سۆنەری بۆ دەكەن، بابزانین سۆنەری ژنان چۆنە؟ لەماڵێكدا كە سەروپێی حەیوان چاك و پاك بكەن، دێن سەری حەیوانەكە دەهێنن و وە هەردوو دەستیان دەخەنە ناو دەمەی حەیوانەكەوە، ئەمجا بەهەردوو دەستیان دەمی ئەو حەیوانە هەڵ دەقڵیشێنن، پێش ئەوەی كە هەڵی بقڵیشێنن، ئەگەر ئافرەتێك سكی هەبێت، دەڵێن: بابزانین باجی فلان كەس سكەكەی كوڕ دەردەچێت یاخود كچ، ئەمجا بەهەردوو دەستیان توند دەمی حەیوانەكە لەیەك دەكەنەوە، ئەگەر لای شەویلگەی ئەو

حەیوانە بەشی سەرەوەی گۆشتی پێوە بێت، دەڵێن: پرچینەیە! یعنی کچە سکەکەی، بەڵام ئەگەر گۆشتی پێوە نەبێت، دەڵێن: قۆتینەیە! یعنی کوڕ ئەبێت سکەکەی.

- یاخود هەندێك لە ئافرەتان کە چوو سۆنەر بکات، تا بزانێت سکەکەی کوڕە یان کچ، ئەگەر کوڕ بوو ئەوا تا ئەو کوڕە لەدایك دەبێت ئەو ئافرەتەو مێردەکەی و وە کەس و کاری هەمووی لەو پەڕی خۆشیدا دەژین، بەڵام ئەگەر وتیان کچە ئەوا ئیتر لەخەفەتدا دنیایان بەسەردا کاول دەبێت، هەتا ئەو کچە لەدایك دەبێت ئەم ئافرەتەو کەسوکاری لەوپەڕی بێ تاقەتی و دڵ تەنگیدا دەبن، ئەگەر لەباری نەبات و وە لەناویشی نەبات باشە، یاخود ئافرەتی وا هەیە سکەکەی لەناو دەبات، بۆ ؟ چونکە سکەکەی کچەو کوڕ نییە، بۆ نموونە:

هەندێك لەئافرەتان کە کاتی منداڵ بوونیان دێت، بەشێوەیەکی ئاسایی منداڵەکەیان نابێت، بەڵکو دەبێت بە نەشتەرگەری گەورە منداڵەکەیان ببێت، ئەگەر نەشتەرگەری بۆ نەکرێت ئەوا ئەو منداڵە لەناو ڕەحمیدا دەخنکێت ، لە شوێنێك (......) ئافرەتێك منداڵەکەی بەئاسایی لێ نەبۆتەوە پێیان وتووە: دەبێت نەشتەرگەریت بۆ بکرێت، بەڵام لەسەر ڕەزامەندی خۆت نەشتەرگەریەکەت بۆ دەکەین و دەبێ ئیمزایشی بکەی، یان ئەگەر نەیکەیت منداڵەکەت بەئاسایی نابێت، کە کاتی خۆیشی بەسەر چوو منداڵەکەت دەخنکێت، ئافرەتەکەش وتوویەتی: جارێ پێم بڵێن کوڕە یان کچ؟ وتویانە: سکەکەت کچە. وتوویەتی: دەی خۆم عەمەلیات ناکەم بابخنکێت مادەم کچە!! ، بۆچی خۆم لەت و پەت و عەمەلیات بکەم کە کچ بێت !! .

- یاخود هەندێ لە ئافرەتان دوای ئەوەی کە چەند کچێکی بووە، مێردەکەی هەڕەشەی لێ دەکات، و پێی دەڵێت: تۆ هەر کچت دەبێت، ئەگەر ئەمجارەش سکەکەت هەر کچ بێت، ئەوا تەلاقت ئەدەم، بۆ نموونە:

لەیەکێك لەنەخۆشخانەکان ئافرەتێك زۆر بەکوڵ گریاوە، وە ئەو ئافرەتانەی کە لەو ژوورەدا وەکو ئەونەخۆشبوون، پێیان ووتوە: ئەوە بۆ دەگریت خوشکە؟ ئەویش وتوویەتی: چونکە مێردەکەم پێی وتووم ئەگەر ئەم جارەش وەك جاران کچت ببێت ئەوا تەلاقت دەدەم!! وا ئێستاش سکەکەم کچەو نازانم چی بکەم.

- یاخود هەندێك لە پیاوان كە ژنەكەی دەچێت سۆنەر بكات تابزانێت سكەكەی كوڕە یان كچ ،بە ژنەكەی دەڵێت: نەچیت سۆنەر بكەی، بیر لەوە نەكەیتەوە بڵێیت بابزانم سكەكەم كوڕە یان كچ ،من كوڕم ئەوێت !! ئەبێت كوڕیشت ببێت!!. یاللـه خۆ ئەو پیاوانە ئەزانن كوڕ وكچ بە دەست تۆیە نەك بە دەستی ژن ، ئەی بۆچی ئەم هەڵوێستانە دەنوێنن ووە ئەم قسانە دەكەن .
بەڵكو هەندێك لەپیاوان كە زانی ژنەكەی كچی دەبێت، ئەوا لووت لەژنەكەی دەكات و، تا چەند مانگێكیش لەدوای لەدایك بوونی ئەو كچە بچكۆلانەیە باوكی نەسەیری دەكات و نەدەیشی دوێنێت، یاخود سوێند بە خوا پیاوی وا سەرپووچ هەیە نوێژ وڕۆژوو وعیبادەت ناكات بۆ خوا ، بۆ؟چونكە كوڕی نییە،وە دەڵێت:باخوا كوڕێكم بداتێ ئەمجا نوێژو ڕۆژوی بۆ ئەكەم!! . ئـا بەم نارەحەتییە ئەمجا كچەی داماو لەدایك دەبێت.
٢- دوای لەدایك بوون: نەسوننەتی عەقیقەی بۆ دەكەن، نە دڵخۆشی دەردەبڕن، نەشوكرانەی خوای لەسەر دەكەن، بەڵكو بەبێ تاقەتی و خەفەتبارییەوە دادەنیشن، هەندێ لەئافرەتان كە كچی دەبێت و وە فلان ئافرەتی تریش هەر كوڕی دەبێت، ئەم دڵخۆشی خۆی بەوە دەداتەوە كە هەر كەسێك دێت بۆلای دەڵێت: قەیناكە كچە!! بەس نییە معجیزەیەكم نەبوو، ئەگەر معجیزەیەكم ببوایە چیم بكردایە.
بەڵكو ئافرەتی بەسەزمانی وا هەیە كە كچی دەبێت ،لەدوای ئەو هەموو ئازارەی كە بەدڵیا چووە لە كاتی منداڵ بوندا ،كەچی ئافرەتی بێ عەقڵی وا هەیە كە دەچێت بۆ لای ،كەدەزانێت كچی بووە لەجیاتی پیرۆزبای لێ بكات یەكسەر پێی دەڵێت: ئەوا ئەم جارەش كچت بۆتەوە دەك ڕاست نەبیتەوە!!.
بەڵێ، لەهەندێ لادێ كوردستان، دەڵێن تا دوو ڕۆژێك دایك و خوشك و ژنانی كەس وكاری ئەو ماڵە شین و گریانیان وەكو تەعزییە داناوە، بـۆ ؟ چونكە كچیان بووە.
ئەمجا نەگوێزەبانەی بۆ دەگێڕن، نەبانگی بەگوێدا دەدەن، بەڵكو لەلای خۆیانەوە ناوێكی لێ دەنێن و تەواو. بەڵام ئەگەر ئەو منداڵە كوڕ بوایە، لەخۆشیا نەیاندەزانی چی بكەن، هەر كەس مژدەی ببردایە یەكسەر مژدەی چاكی وەردەگرت، گوێزەبانە بەلاش دەبوو، هەر كەس دەچوو بۆ ماڵیان وەكو جەژن نوقڵیان بۆ دەگێڕا،

عەقیقەیان بۆ دەکرد، دەی ئەمجا بڕۆ ناوی جوانی بۆ بدۆزنەوە، بەچەند کەسێك بەدوا ناودا دەگەڕان، ئەمجا ئێوارەك مەلایەك و کۆمەڵێك لە خزم و کەسوکارو دراوسێیان بانگ دەکرد و وە دەعوەتیان بۆ ئامادە دەکردن، تا بانگ بەگوێی دا بدەن و ناوی لێ بنێن، ئەو شەوە تا درەنگماڵیان جمەی دەهات لەقەرەباڵغیدا، بەلاّم ئێستاکە کە کچە مالیان بێ دەنگ، خەفەتبارن، زوو بێ دەنگی لێ دەکەن وەکو وابێ کە لەم ماڵەدا هیچ شتێك ڕووی نەدابێت.

- یاخود ئافرەتی وامەیە کە کچەکەی دەبێت ، ئەڵێت: نایبمەوە لەگەڵ خۆمدا مادەم کچە، بۆ نموونە: لە یەکێك لە نەخۆشخانەکان ئافرەتێك کە کچی بووە،ووتویەتی: نایبەمەوە لەگەڵ خۆمدا، با کێ دەیبات بۆ خۆی بیبات!!، هەتتا خەڵکێکی زۆر دەوریان لەو ژنە داوە لە سەرسوڕمانی ئەوەی کە ئەم ژنە لەبەر ئەوەی کچی بووە فڕێی دەدات، دوایی دکتۆرەکە هاتووە وتوویەتی بۆ ناتەوێ؟ ، ژنەکەش وتوویەتی: بۆ کوێی ببەمەوە دانەیەکی ترم هەیە هێشتا لە ناو بێشکەدایە . وا دیارە ئەوەی ناو بێشکەکەیشی هەر کچ بووە، بۆیە وا بە زوویی سکی بۆتەوە هەتا کوڕی ببێت .

٣- ئەو کچە بەسەزمانە تا گەورە دەبێت:

- کە تۆزێ ئەو کچە بەشێوەیەك بجوڵێتەوە دایکەکەی دەست دەکات بەبۆڵە بۆڵ و ناشکوری کردن: خوایە من ئائەمە بۆچی بوو، بۆخۆت نامەوێ، ئەگەر چاك بوویە نەت ئەدا بەمن، بەکێ ئائەم هەموو کچە بەخێو ئەکرێت،کەچی ئەو دایکە کەئێستا وا دەڵێت بە کچەکەی وەختێ خۆی خۆیشی کچ بووە، ئێستا ڕقی لەوەیە کە کچی ببێت .

- تا دەستێك جلی بۆ دەکات، ئەبێت جلەکانی بەری کۆن و دڕاو بن، ئەمجا دایکی دەستی لەدڵی دەبێتەوە.

- بەناوو ناتۆرەو ناوی ناشیرین بانگی دەکات: دەڵەسەك ،دێڵ ، دەڵە شڕ، چەتیو.

- دوعای خراپی لێ دەکات: دەك بەدبەخت بیت، دەك نەحەساوە بیت، دەك سەرت لەقوڕنێیت،دەك خێر لە خۆت نەبینی.

- هەموو ئیش و کارێکی ماڵی پێ ئەکات،لە جل شۆردن،و حاجەت شۆردن،و گسك دان،و منداڵ شۆردن،و ئاوهێنان (ئەگەر بێ ناو بن)،و چێشت لێنان،و فەرش

شۆردن،کە زستانیش هات هەموو ناو ماڵی پێ دادەخات وە کە هاوین هات هەموویشی پێ هەڵدەگرێتەوە ،وە کچەی داماو دەبێ چڵکن و چڵمن و هیلاك و ماندو بێت، بۆچی؟ چونکە نانی ئەدەنی و بەخێوی ئەکەن.

بەڵام ئەگەر ئەو منداڵە کوڕ بووایە:

وەکو کەڵەگا دەژیا، کام جل جوان و کام یاری جوان بووایە بۆ کوڕەکە بوو، ڕۆژانە چی حەز لێبوایە بۆیان دەکری، پارەو خەرجانەی زۆریان دەدایێ، کچەکەی دەبێت خەریکی ئیش و کاری ماڵ بێت، بەڵام کوڕەکەش لەژوورەوە دەخەوت، هەرچی بکات عفوی لێ دەدراوە، چ کارێکی خراپ بکا چاوپۆشی لێ دەکرێت و هەمیشە لەماڵەوە و دەرەوە شەڕفرۆش ئاژاوەچی و بیانوو گێڕە، بۆ هەموو ئەمانەی لێ قبوڵ دەکرێت!؟ چونکە قەیناکە کوڕە شوکور.

لەسەرو ئەمانەشەوە بەجوانترین ناو بانگی لێ دەکات: کاکە، شوانە گیان. بۆ پێی دەڵێت شوانە؟ چونکە شوانی ئەو کچانایە،واتە:کوڕەکەی دەکا بەشوان و کچەکانی دەکا بەحەیوان و مەڕو ماڵات، کەچی لەڕاستیدا بەپێچەوانەوەیە هەر کوڕەکەی دیار نەبوو دایکەکەی هاوار دەکات :

چەتیو کوڕەکە چی لێ هات؟ چوو بۆ کوێ، ڕاکە بیدۆزەرەوە،بەخوا شتێکی لێبێت سەرت هەڵ نەکەنم وقژت لەسەر ئەبڕم، هەمیشە ئەو کچانە دەبێت چاویان لەسەر ئەو کوڕە بێت بەدوای ئەم کوڕەوە بن.

٤- کەدەیخاتە قوتابخانە:

- ئەگەر خستیە قوتابخانەش، هەمیشە منەتی بەسەردا دەکات، دەڵێت پێی: پێت ئەخوێنم، خۆ بەخۆڕایی پێت ناخوێنم، ئەبێ لەبری ئەوە هەموو ئیشێ بکەی، کە خوێندنیشی تەواو کرد، پێی دەڵێت: تۆ هیچ نەبوویت ئێمە پێمان خوێندی و کردمانی بەشت، ئەگین ئێمە پێمان نەخوێندیتایە ئێستا تۆ هیچ نەبووی،دوایش هەموو معاشەکەی لێ وەر دەگرن، و تۆزێکی جار جار ئەدانەوە پێی وەکو خێر بەسواڵکەر بکەن.

- لەکاتی خوێندن دا دایکی نایەڵێت سەعی بکات، هەر ڕۆژێك سەعی و تاقی کردنەوەی هەبێت، ئەوا ئەو ڕۆژە لەهەموو ڕۆژەکان زیاتر ئیشکی پێ دەکاو ئیشی

**٧٣- ئەم قسەیە "طورُ اللهِ في برسيمه" : واتە : گای خوا لە لەوەڕگاکەیدایە.**

ئەمە پەندێکە هەندێ لەخەڵکی بەنموونە دەیهێنێتەوە بۆ کەسێك کە لەقسە تێ نەگات، وە مەبەستیان بەووشەی (طـور) یعنـی گـا، وە ئـەم پەندەش پەندێکی هـەڵـەیە، لەبەرئەوەی خوای گەورە گـای نییە تا لـە لەوەرگاکەیدا بلەوەڕێت، وە پێویستە ئێمەی موسوڵمان زمانمان پاك بکەینەوە و بەدووری بگرین ئـا لـەم جۆرە قسانە.

**٧٤- ئەم قسەیە "دستورُ يا سيادي" : واتە : پارێزگاریتان ئەی گەورەمیان.**

ئـەم قـسەیە هەنـدێ لەخـەڵکی نـەزان دەیڵـێن، ئەگـەر بـچنە شـوێنێکی تاریکەوە یاخود بـچنە شوێنێکی ترسناکەوە،کە دەڵێـی مۆڵـەتی چونە ژوورەوە بۆ ئـەو شـوێنە لـە جنۆکـە وەردەگـرن ،کـە بـێ گومـان ئەمـەش هـەڵــەیە،چونکە خــوای گــەورە دەفــەرموێت: ﴿وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ ٱلۡإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ ٱلۡجِنِّ فَزَادُوهُمۡ رَهَقًا﴾ (الجـن: ٦)، واتــە: کۆمەڵێ لەپیاوانی ئادەمیزاد لە بەر نـەفامی و نـەزانینیان لەچۆڵەوانی و دەشـت و دۆڵ و کـەژدا لـە ترسـاندا پـەنایان بـەپیاوانی جنۆکـە دەبـرد، بەڵام جنۆکەکان زیاتر دەیان ترساندن.

بەڵکو بێگومان پێویستە لەسەرت کە شوێن ڕێنموونییەکانی پێغەمبـەری بـەڕێز (ﷺ) بکـەوێت لەکاتێکدا کـە دەچـیتە شـوێنێك، هـەتاوەکو هـیچ شتێك زیانت پـێ نەگەیەنێت.

---

بۆ نەدۆزێتـەوە، بـۆ؟ چـونکە دەڵێـت: بـانەبێت بـەهیچ یـان سـبەی کـە شـووی کـرد معاشەکەی بۆ کوڕی خەڵك دەبێت.

وه فەرمووده‌یه‌ك له (خوله ی كچی حه كیم)ه وه هاتووه- ڕەزای خوای لێ بێت- كه فەرموویه‌تی: گوێم له پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) بوو ده‌ی فه‌رموو: (مَن نَزَلَ منزلاً ثُمَّ قالَ: اعوذُ بكلمات اللهِ التّاماتِ من شرِّ ما خلق. لم يضره شيءٌ حتى يرتحلَ من منزله ذلك)[1]، واته: هه‌ر كه‌سێك چووه شوێنێك‌و پاشان ووتی: ( أعوذ بكلماتِ اللهِ التّاماتِ من شرّ ما خلق)، واته: په‌نا ده‌گرم به‌ووشه ته‌واوه‌كانی خودا له خراپه‌ی دروست كراوه‌كانی،ئه‌وا ئه‌و كه‌سه هیچ شتێك زیانی پێ ناگه‌یه‌نێت، هه‌تا وه‌كو ده‌ڕوات له‌و شوێنه‌ی كه تیایه‌تی.[2]

---

[1]حديثٌ صحيح: رواه مسلم (٤/ ٢٠٨٠).

[2]ئه‌م جۆره خۆسپاردنه به‌جنۆكه و وه داواكردنی پاراستن له ترساندا لێیان، لای ئێمه‌ش هه‌یه:

- به‌تایبه‌ت له‌ناو چینی ئه‌و منداڵاندا هه‌یه، كه ماڵه‌كانیان له‌و گه‌ڕه‌كانه‌ن كه‌وا كه‌وتوونه‌ته چوارده‌وری شار، كه ئه‌و گه‌ڕه‌كانه نزیكن له‌شوێنی چۆڵ و ده‌شت و ده‌ره‌وه، كاتێك كه ده‌چنه شوێنێكی چۆڵ ووه دوور ده‌كه‌ونه‌وه، كه گه‌یشتنه ئه‌و شوێنه ده‌ڵێن: ئه‌وا خۆمان به‌جنۆكه‌ی ئه‌م شوێنه ده‌سپێرین!! به‌گومانی ئه‌وه‌ی ئه‌گه‌ر هه‌ر جنۆكه‌یه‌ك هه‌بێت له‌و شوێنه‌دا ئه‌مان نه‌ترسێنێ و ئازاریان نه‌دات،وه به‌ڵكو ئه‌و جنۆكه هه‌ستێت به پاراستنیان له‌ترس و، وه هه‌ر ناڕه‌حه‌تییه‌ك كه ڕووبه‌ڕوویان ببێته‌وه، كه‌چی له‌به‌ر منداڵی خۆیان نازانن كه یه‌كه‌م دوژمنی مرۆڤ جنۆكه و شه‌یتانه، هه‌ر كه ئه‌مان خۆیان پێ سپارد ئیتر زۆرتر و زیاتر ده‌یان ترسێنێ، وه بۆ ئه‌وه‌ی زیاتر ناڕه‌حه‌ت بن، چونكه شه‌یتان پێی خۆشه هه‌میشه مرۆڤ له زه‌لیلی دا ببینێ.

**٧٥- ناونانی منداڵ بەناوی (عبدُالموجود)ەوە[1]: واتە: بەندەی زاتێك كە بەدیهێنراوە.**

بێگومان ئەم ناوە ناوێكی هەڵەیە، لەبەرئەوەی ناوی (الموجود) یەكێك نیە لەناوەكانی خودا، وە ڕاستیەكەیشی ئەوەیە كە بوترێت: (**عبدالواجد**)، واتە: بەندەی زاتێك كە دروستكەرو بەدیهێنەرە.

**٧٦- ناونانی منداڵ بەناوی (عبدُالعال)ەوە:**

وە ئەم ناونانەش دووبارە هەڵەیە، چونكە پەروەردگار ناوی (العال) نییە، بەڵكو ڕاستەیەكی ئەوەیە كە بووترێت (**عبد الأعلی**) واتە: بەندەی ئەو خوایەی كە زۆر بڵندە، یاخود بووترێت (**عبدُالمُتعال**)، واتە: بەندەی ئەو خوایەی كە زۆر بەرزو خۆ بەرزو بڵندگرە.

**٧٧- ناونانی منداڵ بەناوی (عبدُالسَّتار)[2]ەوە:**

وە ئەمەش هەڵەیە، وە ڕاستیەكەی ئەوەیە كە بووترێت (**عبدُ السَّتیر**)، واتە: بەندەی ئەو خوایەی كە زۆر داپۆشەرو زۆر پارێزەرە، لەبەرئەوەی ووشەی (السّتار) یەكێك نییە لەناوە جوانەكانی خوای پەروەردگار.

**٧٨- ناونانی منداڵ بەناوی (عبدُالعاطي)ەوە:**

وە هەروەها ئەم ناوەش هەڵەیە، وە ڕاستییەكەی ئەوەیە كە ناوبنرێت بە ناوی (**عبدالمُعطي**)ەوە، واتە: بەندەی ئەو خوایەی كە زۆر بەخشندەیە، لەبەرئەوەی ووشەی (العاطي)، واتە: بەخشەر، یەكێك نییە لە ناوەجوانەكانی خوای گەورە.

---

[1] بگەڕێرەوە بۆ پەرتووكی: (اقوالُ وافعالٌ خاطئة)ی (زهران) لاپەڕە (١٠٥-١٠٦).

[2] لای ئێمە لەگەڵ بوونی ناوی (عبدُ السّتار) كە هەیە، ناوی (عبدالباقی و عبدالحامی)یش هەیە، كە نە (الستار و، وە نە الباقی و، وەنە الحامی) هیچ كامێكیان ناوو سیفاتی خوای گەورەش نین.

**٧٩- ناونانی منداڵ بەناوی (عبدُ النَّبيّ)ەوە: واتە: بەندەی پێغەمبەر (ﷺ).**
وە ئەم ناوەش هەر هەڵەیە، وە ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئەو منداڵە ناوەکەی ئاوەها بێت: (**عبدُربِّ الرّسول**)، واتە: بەندەی پەروەردگاری پێغەمبەر(ﷺ).
**٨٠- ناونانی منداڵ بەناوی (عبد الرّسول)[1]ەوە: واتە: بەندەی پێغەمبەر (ﷺ).**
وە ئەمەش وەك ناوەکەی پێشوو هەڵەیە، وە ڕاستییەکەی ئەوەیە کە بووترێت: (**عبدُربِّ الرّسول**)، واتە: بەندەی پەروەردگاری پێغەمبەر(ﷺ).[2]

---

[1] بگەڕێرەوە بۆ پەرتووکی (تسميةُ المولود)ی ، د. بكر ابو زيد.
[2] بەڵام زۆر زۆر بەکەمی لە ناو کورددا ناوی(عبدُ محمد) هەیە .

## کۆمەڵێکی جۆراو جۆری تر لە بیروباوەڕی پڕوپووچ :-

- ئاو کە ڕژا لەناوماڵدا، ئەوا ڕووناکییە بۆ ئەو ماڵە.
- شەکر زۆر بکەیتە ناو چاوە، شیرین دەبێت لای خەڵك.
- مەیمون وەختی خۆی پیرێژن بووە کە کوفری کردووە، خوای گەورە کردوویەتی بەمەیمون (یعنی لای هەندێ خەڵکی نەزان ئەصڵی مەیمون لەوەوە هاتووە).
- نەخۆشی سورێژە بۆ ئەوەی چاك ببێت، کراسی سوور بکە بەری نەخۆشەکە.
- هەرئیشێکت کرد، دەڵێن: بۆئەوەی ئەو ئیشەت سەرکەوتوو بێت کە باسی ئیشەکەت کرد، بڵێ: چرای لەسەربێت !!.
- لەهەندێك شوێن کە یەکێك مار پێوەی بدایە، ئەوا بۆ پیرۆزی و وە بۆ ئەوەی چاك ببێتەوە، شیری مانگایەکی زەردیان بۆ هێناوە تا بیخوات و چاك ببێت.
- لەهەندێك شوێن کاتێك کە کەسێك تووشی گرانەتا بووە، ئەوا چوون بۆلای پیاوێك کە بەپیرۆزیان زانیوە، ئەویش دەست نوێژی گرتووە و وە ئاوی دەست نوێژەکەیان کۆکردۆتەوە لەناو تەشتێکدا، وە دوایی ئەو ئاوی دەست نوێژەیان دەرخواری ئەو نەخۆشە داوا ، بەمەبەستی شیفاو چاك بوونەوە.

- لەهەندێ لادێی کوردستان، ئەگەر کەسێك کە لەناو ئەو کۆمەڵە مریشکەی کە بەخێویانی کردووە، مریشکێکی کونج کونجی تیا بوبێت، کاتێك کە ئەو مریشکە هێلکەی کردووە، هاتوون زەردێنەی هێلکەکەیان دەردەهێناوە، و وە هەر کەسێك چاوی ئازاری کرد بێت کردویانەتە چاوی ئەو کەسەوە، ووە ووتویانە: زەردێنەی هێلکەی مریشکی کونج کونج شیفایە بۆ چاو ئێشە!!.

- دەڵێن: ئەگەر یەکەم ڕۆژ چوویت بۆلای ژنی زەیستان، ئیتر نابێت لەو ماڵە بڕۆی هەتا حەوت ڕۆژ، بەڵام ئەگەر ڕۆشتی دەبێت پارچەیەك لە جلەکانت بەجێ بهێڵی، چونکە ئەو ئافرەتە زەیستانە حەوتەی سەر دەکەوێت.

- هەندێك لە خەڵکی گاڵتە بە دوعا دەکات، کاتێك کە کەسێك دوعای لێ بکات، دەڵێت: ئەگەر بەدوعا دەبوو، پشقل بە خورما دەبوو.

- ژنان دەڵێن: ئەگەر یەکێ خێری بۆ هێنای مەیخۆ، نەك سیحری لێ کردبێت، دوای ئەوەی کە خێرەکەت بۆ هات بیکە ناو تەنەکەی خۆڵەکەتەوە.

- یاخود لە هەندێك لە لادێکاندا بۆ بەخت کردنەوەی کچ ئا بەم شێوەزەیان کردووە: کاتێك کە ماڵێك چوونە داخوازی کچی ماڵێکی تر و وە نەیان دابنێ، وە کە چەند جارێکی تر کە بچونایەتەوەو ،وە هەر فەشەلی بهێنایە، ئا لەم کاتەدا بەو کچەیان ووتووە: بەختی بەستراوە بۆیە بەنسیبمان نابێت، چوون گورگێکیان کوشتووەو، وە پارچەیەك لە چەرمی گورگەکەیان ووشك کردۆتەوە و لەپەڕۆیەکی سپییان پێچاوەو وە داویانە بەو کوڕەی کە داوای ئەو کچەی کردووە، بۆ ئەوەی کە جارێکی تر کەچووەوە بۆ داخوازی کردنی نیاز بێتە جێ و بەختیان بکرێتەوە.

- ئەگەر جوویت بۆ ماڵێك کەخواردنیان بۆ دانایت،بەڵام تۆ کەمت لەو خواردنە خوارد،ئەوا لەم کاتەدا خاوەن ماڵەکە بێت ئەڵێت:بۆ ناخۆی ، ئەگین ئەم خواردنە لە قیامەتدا شکاتت لێ دەکات.

- باوەڕبوونی هەڵە لەنیسکدا:

دەڵێن: ئەگەر یەکەم ڕۆژی مانگی ڕەمەزان ئێوارەکەی نیسکێنە بخۆیت، ئەوا ئەو نیسکە هەتا مانگی ڕەمەزان تەواو دەبێت لەناو سکی ئەو کەسەی دا کە ئەم نیسکەی خواردووە زیکر دەکات هەتا کۆتایی مانگی ڕەمەزان.

- باوەڕبوونی هەڵە لەخەودا:
- ئەگەر لەخەودا، خەو بە کەروێشکی نێرەوە ببینی،ئەوا مێردەکەت تەڵاقت دەدات.
- ئەگەر خەوت بە شفتەوە ببینی ئەوا شوو دەکەی.
- باوەڕبوونی هەڵە لەجوان بووندا:
- دەڵێن: ئەگەر قاچە مریشك بخۆیت ئەوا جوان دەبیت!!.
- یاخود ئەگەر ڕووبکەیتە پشتیماڵەکەت ئەوا جوان دەبیت!!.
- باوەڕبوونی هەڵە لەدڵ پاکیدا:
- ئەگەر دوو کەس لەگەڵ یەکتردا قسەیان کرد، ئەگەر جارێك هەردووکیان هەر هەمان یەك قسە لەیەك کاتدا لەدەمیانەوە بێتە دەرەوە، دەڵێن: ئەوا دڵمان لەیەکتر پاکە.
- یاخود ئەگەر لەکاتی ڕۆشتندا لەچەند شوێنێکدا دوو کەس بەیەك بگەنەوە، دەڵێن: ئەوا دڵمان لەیەك پاکە.
- یاخود ئەگەر چوویتە شوێنێك و وە خواردنێکی خۆش دانرا بوو ئەوا دەڵێن: خەسووت تۆی خۆش دەوێت.
- باوەڕبوونی هەڵە لەمیواندا:
- ئەگەر ماڵێك میوانێك بچێت بۆ ماڵیان، ئەگەر ئەو میوانەیان ڕق لێبێتەوە، یاخود ئەو میوانە لەو ماڵە زۆر دابنیشیت، ئەوا خاوەنی ماڵەکە دەڵیت: بچن خوێی بۆ بکەنە پێڵاوەکانی، ئەوا زوو دەڕوات.
- ئەگەر هەویر بپەڕێت، ئەوا میوانیت دێت.
- ئەگەر تاڵێك قژ بێتە سەر چاوت، دەڵێن میوانت دێت.
- ئەگەر لەبەرەبەیاندا، پۆلێك چۆلەکە بەجریوە جریو ڕووبکاتە ماڵەکەت، ئەوا میوانت دێت.
- ئەگەر هەویر لەدەستت بکەوێتە خوارەوە ئەوا دەڵێن: ئەمڕۆ میوانمان دێت.
- **دەمی گورگ بەستن:**
- ئەم دەم بەستنی گورگە بیروباوەڕێکی زۆر بەربڵاوە لە کوردستاندا، کە بەشێوەیەك لەهەموو لادێکانی کوردستاندا ئەمە هەبووە، وە ئێستاش هەر ماوە ،و

وە خەڵکانێکی زۆریش ئێستاش هەر باوەڕییان پێی ماوە، کە بریتییە لەوەی: ئەگەر لە لادێیەکدا مەڕو ماڵاتەکەیان وەکو ڕۆژان لە ئێوارانـدا نەهاتبێتـەوە بـۆ لادێکەیان، بەهۆی ئەوەی کەوا تووشی گیروگرفتێك بهاتایەتە ڕێی گەیشتنەوەی ئەو مەڕو ماڵاتە بۆ لادێکە، یاخود یەکێك لەو مەڕو ماڵاتە تەرە بوبێت لەوانەی ترو وون ببوایـە، ئـا لـەم کاتـەدا خاوەنـەکانیان ترسـی ئـەوەیان لێ دەنیـشت کـەوا گـورگ مەڕوماڵاتەکەیان بخوات، بەڵام بۆئەوەی بەسەلامەتی لەدەست گورگ ڕزگاریان ببێت، خـەڵکی لادێکـە هـاتوون بـۆ لای شـێخێکی لادێکـەی خۆیـان و داوایـان لێکـردووە کـە دەمی گورگیان بۆ ببەستێت، ئەمجا" کاکی شێخ"یش هاتووە چەقۆیەکی لـەو کەسـە وەرگرتـووە کـە ترسـاوە ئـاژەڵەکـانی گـورگ بیخـوات، پـاشان دەمـی چەقـۆکەی کـردۆتـەوە و( سورەتی الشّمس ) ی کە لەجزئی (عمّ) دا هەیە بەسەردا خوێندووە، کـە خـوای گـەورە لەسـەرەتای ئـەم سـورەتەدا دەفـەرموێت : (**والـشّمش و ضُحها،والقمر اذا تَلَها** ) کە گەیشتۆتە کۆتایی سورەتەکە کە خوا دەفەرموێت : (**ولایَخافُ عُقبَها**)، ئەمجا " کاکەی شێخ" وتیویەتی : ( **ولا یخاف عُقبها،دەمی گورم ڕەقباها، چاوی گورگم کوێر باها** ) ، وە ئیتر یەکسەر دەمی چەقۆکەی داخستووە ،و وە بەخاوەنی ئەو چەقۆیەی وتووە: ئەوا دەمـی گـورگم بۆ بەستی!! ئیتر گورگ نایانخوات، بەڵام تا حەیوانەکان دێنەوە بۆ لادێکە نابێت دەمی چەقۆکە بکرێتـەوە، ئـەگین بیکەیتـەوە ئـەوا دەمـی گورکـەکان دەکرێنـەوە ، لەدوایـدا کـابرای داماو چەقۆکەی لەشـوێنێکی تایبەتـدا هـەڵگرتووە، بۆئـەوەی نـەکا یـەکێك دەمـی چـەقۆکە بکاتـەوە، بەمـەش دەمـی گـورگی ئـەو دەشـتە دەمیـان بکرێتـەوە و حەیوانـەکانیان بخـوات ، بەحـسابی ئـەو خەڵکـە دەمـی گورگـەکان ڕەق بـووە و ئـیتر ناکرێتەوە تا بتوانی ئاژەڵەکانیان بخوات ، بەڵام شتێ لەوە سەیرتر ئەوەیە ئەگەر کاکی شێخ حەزی کردبێت حەیوانی فلأنە کەسێك گورگ بیخوات، کە ئەو کەسە هـاتووە بـۆ لای شـێخ تـا دەمـی گـورگی بـۆ ببەسـتیت ، لـەم کاتـەدا" کاکـە شـێخ" بەپێچەوانەوە دەم بەستەکەی بۆی کردووە، ئەمجا ڕەشیان مامە شێخ بەسەر دەمی چـەقۆ کراوەکـەدا هـەر(سـورەتی الـشمس)ی بەسـەردا خوێندووە،بـەڵام پـاش

لــــه كــۆتــايــيدا : ئەمە كۆتا شتێكە كە كۆمكردۆتەوە، داواكارم لە خــواى گــەورە كــە ســوود بەخــشم بكــات بــەم پەرتووكــە، وە لێـشمى وەربگرێت بەوەرگرتنێكى جوان، چونكە هەر ئەو دەست بەردارو زامن و وەرگــرى هــەموو شــتێكى جوانــە، وە هــەر ئــەويش گەورەمانــەو باشــترين هاوكاريكەرمانە.



---

تەواوبوونى سورەتەكە كاك شێخ وتوويـەتى: ( وە شـەمـسى و لقەمـەرىٚ گورگى ئەو بەرى ئاوايى بێتە ئەمبەرىٚ، چەرمىٚ پشتە قنى بە سەر سەريدا ببـەرىٚ)، واتە:وا گورگ ئەو حەيوانە بخوات چەرمى پشتى تا تەوقى سەرى حەيوانەكە ببات.
بەلاّم سەيرتر ئەوەيە: كە هەندێك لەخەڵكى كەباخيان هـەبووە، و وە چۆلەكە زۆرى بۆ باخەكەيان هێنـاوە، داوايـان كردووە لەيـەكێك كە دەم بەسـت دەكـات كـەوا دەمـى چۆلەكەيان بۆ ببەستێت، بۆئەوەى ئيتر ئەو چۆلەكانە بەروبوومى باخەكەى نەخۆن.
وە هەروەها ئەگەر ئافرەتێك مێردەكەى خراپ بوو بێت بۆى ووە جنێوى پىٚ دابێت، ئەوا ئەو ئافرەتە چووە بۆلاى شێخێكو پـىٚ وتـووە: كاكە شێخ گيـان!! بەشكو دەم بەستێكم بۆ بكەى و دەمى مێردەكەمم بۆ ببەستى، بەڵكو ئيتر نـەتوانێت جنێوم پـىٚ بدات.